د. ئەورەحمانی حاجی مارف
کۆلێجی پەروەردە ـ زانکۆی بەغدا

# ڕێزمانی کوردی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

بەرگی یەکەم

## (وشەسازی)

بەشی سێیەم

## ـ ئاوەڵناو ـ

لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد
بەغدا ١٤١٢ ك ـ ١٩٩٢ ز

منتدى إقرأ الثقافي

د . ئەورەحمانی حاجی مارف

بەشی کوردی ـ کۆلێجی پەروەردە
زانکۆی بەغدا

# ڕێزمانی کوردی

بەرگی یەکەم

## ( وشەسازی )

بەشی سێیەم

## ـ ئاوەڵناو ـ

لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد.
بەغدا ١٤١٢ ك ـ ١٩٩١ ز

منتدى إقرأ الثقافي

# پێشەکی

ئەو زانستەی لە وشەسازیی زمان دەکۆڵێتەوە ، گەلێ کێشەی جۆربەجۆر ساخدەکاتەوە . ئەگەر لەسەر بناغەی یاساکانی زمانناسی بڕوانینە ئەو کێشانە ، ئەوە لە تواناداا نی یە لە تێکڕایان بدوێین . جا بۆیە بۆ تێگەیشتنی دیاردە هەرە گرنگەکانی پێکهاتنی وشەسازی هەوڵ دەدەین تەنیا ئاوڕ لە کێشە سەرەکی یەکان بدەینەوە ، کە ئەمانەن :

١ ـ جیاوازیی وشە چی یە لە بارێکدا ماکێکی وشەسازی بێ ، لەگەڵ ئەوەی ماکێکی ڕستەسازی بێ ؟

٢ ـ مەبەست لە بەشەکانی ئاخاوتن چی یەو لەسەر چ بنەماو بنچینەیێکی زانستی دابەش کراون ؟

٣ ـ پێکهاتنی هەر بەشە ئاخاوتنێك .

٤ ـ تایبەتێتی بەشەکانی ئاخاوتن لە زمانانی جیاوازدا .

٥ ـ مەفهوومی « بەشەکانی ئاخاوتن » توانای نیشاندانی هەموو حاڵەتە هەمەچەشنەکانی وشەسازی هەیە ؟

٦ ـ پێوەندیی نێوان حاڵەتەکانی وشەسازیو ژێربێژی لە چ بارێکدایە ؟

... هتد .

کێشەی گران لەوەدایە . کە هەر یەك وشە دەبێ هەر جارەی بە جۆرێ سەیربکرێ . جارێك وەك دیاردەی وشەسازی بزانرێ ناوە یان کردارە یان ئاوەڵکردارە ... و جارێکیش وەك دیاردەی ڕستەسازی ئاشکرا بکرێ نیهادە یان گوزارەیە یان تەواوکەرە ... بەوێنە لە ڕستەی : « دارا ئازایە »دا دەتوانین هەر وشەیێك بە زاراوەیێکی وشەسازی لێك بدەینەوە ـ واتە بڵێین : « دارا » ـ ناوە ؛ « ئازا » ـ ئاوەڵناوە؛ «ە »ـ کرداری بێهێزە . دەشێ هەر ئەو وشانە بە زاراوەی ڕستەسازی جۆێبکەینەوە ـ واتە بڵێین : « دارا » ـ نیهادەو « ئازایە » ـ گوزارەیە . بەو پێ یە لە یەك وشەدا بوونی خاسیەتی وشەسازیو ڕستەسازی دیاردەیێکی ئاسایی یە ـ واتە هەر یەك وشە لە یەك کاتدا دەتوانێ خاوەنی حاڵەتی وشەسازیو ڕستەسازی بێ .

حاڵەتەکانی وشەسازی بریتی یە لە حاڵەتی وشەو قاڵبی وتە ، هەرچی حاڵەتی ڕستەسازی یە بریتی یە لە شوێنی وتەو زنجیرەی پێکەوەهاتنی وشە . بە واتایێکی دی حاڵاتی وشەسازی بەندە بە وشەوە بێ ئەوەی پێوەندی بە شوێنی وتنیانەوە هەبێ . بە نموونە وشەی « ئارەزوو » هەر بە ناوی دەمێنێتەوە چ نیهاد بێو چ گوزارەو چ تەواوکەر . هەرچی حاڵاتی



منتدى إقرأ الثقافي

ڕستەسازی‌یە ، تەنیا کاتێ لە وشـەدا بەدەردەکـەوێ ، کە ببێتـە ماکـی ئاخاوتن . کەواتە حالاٚتی ڕستەسازی بە وشەوە نەبەستراوەو دەرکەوتنی بەپێی جێ‌و شوێنی وشەیـە لە ئاخاوتنـدا . دەشێ سروشتـی نیشـانەو خاسیەتی وشە لـە وشەسازی‌دا بەبـێ ئاخـاوتن باس‌بکرێ ( هەر لەبـەر ئەوەشە ، کە زۆر جـار لـە فەرهـەنگدا خاسیـەت‌و نیشانـەی وشـە دیاری‌دەکرێ ) . بەلاٚم لە ڕستەسازی‌دا خاسیەتی وشە دوور لە ئاخـاوتن بەدیارناکەوێ . بەڵێ ئەوەی وتوومانـە ، ئـەوە ناگەیـەنێ کـە هـەموو خاسیەتێکی وشەسـازیی وشە بگرێتـەوە . بەوێنـە دیاری‌کردنی مـانای جۆربەجۆری هەندێ حالەت بێ پێوەندیی وشەکان ئاسان نی‌یە ...

هەر یەکێك ، با کەمیش شارەزایی لە زمانەوانیدا هەبێ ، ئاگـاداری بوونی بەشەکانی ئاخاوتنە . بەلاٚم بەشەکانی ئاخـاوتن چین‌و سروشتیـان چی‌یە ؟ تەنانەت لەنێوان پسپـۆڕان‌و زماننـاسانیشدا بۆ وەلاٚمی ئەم پرسیارە ڕایێکی یەکگرتوو نی‌یە .

بەشێکیان دەڵێن بەشەکانی ئاخاوتن جۆرەکانی لێکسیکیی وشـەن . بەو پێ‌یە وا دادەنێن ، کە بەشەکانـی ئاخـاوتن لەسەر بناغـەی لێکسیکی پێك‌دێ (١) .

برێکی دی‌یان وا بیردەکـەنەوە ، کـە بەشەکانی ئاخاوتن بریتی‌یە لە گرووپی وشە لە ڕووی ڕێزمانەوەو لەسەر بناغەی خاسیەتی ڕێزمانیی وشـە سازکراوە . ئەم جۆرە بۆچوونە ڕێگەدەدات بەوەی بەشەکانی ئاخاوتـن ناوبنرێن حالاٚتی ڕێزمانی(٢).

بەشی سێیەم لە بەشەکانی ئاخاوتندا مانای لێکسیکی‌و ڕێزمانی بەدی دەکەن ــ واتە وا دادەنێن کە سروشتـی بەشەکانی ئاخاوتن ئاوێتەیەو لـە

---

( ١ ) بۆ نموونە ، بڕوانە :

أ ) م . دۆکوولێل ، کێشەی حالەتەکانی وشەسازی ، گۆڤـاری « کێشەی زمانناسی » ، ژ٦ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل٧٣ــ٧٤ .

ب ) م. ن. پێترسۆن ، لەبارەی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی ڕووسی‌یەوە، لە کتێبی « پێکهاتنی ڕێزمانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٥ ، ل ٦١ ــ ٦٢.

... و هەندێکی دی .

( ٢ ) وەك :

أ ) ب . ن . گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسـی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٤ .

ب ) ئا . ن . گڤۆزدێـڤ زمانی ئەدەبیی ڕووسیـی ئەمڕۆ ، بەرگـی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ل ١٣٩ .



منتدى إقرأ الثقافي

یەك کاتدا لێکسیکی‌یشەو ڕێزمانی‌یشە(٣) .

دیارە دەشێ ئەو ڕایە پەسەندبکەین، کە بەشەکانی ئاخاوتن لە واقیعدا سنوورێکە لە نێوان گرووپی گەورە گەورەی وشەی زماندا . وشەکانی هەر گرووپێکیش لەناو خۆیاندا هاودەنگن لە گشتی‌یەتی مانای ڕێزمانی‌و شێوەی نیشانەکانیاندا . ئەوەتە یەکێتی مانای ڕێزمانی‌و شێوەی نیشانەکانیان بە حاڵەتی ڕێزمانی ناودەبەین . ئەمەش ڕێگەمان دەدات کە بەشەکانی ئاخاوتن بە حاڵەتی سنوور فراوانی وشەسازی ناوبەرین(٤) .

بەوێنە بەشە ئاخاوتنی ناو گرووپێکە کە گشتێتی مانای ڕێزمانی ـ واتە کەسێك یان شتێك یان بیرێك یان کارێك دیاری‌دەکا ـ و دەربڕینی نیشانەکانی ناسیاوی‌و نەناسیاوی‌و ژمارەو جنس‌و دۆخ ... پێکەوەی بەستوون .

بەو پێیە دەتوانین ئاوڵناو بەو گرووپە وشەیە ناوببەین ، کە چۆنێتی‌و خاسیەت‌و نیشانە دەیانگەیەنێتە یەکتر .

... هتد .

ئایادەکرێ ئە و ڕایە وەبگیرێ ، کە بەشەکانی ئاخاوتن بە گرووپی لێکسیکیی وشە دادەنێ ؟ نەخێر ! ئەگەرچی هەر بەشە ئاخاوتنێك بریتی‌یە لە کۆمەڵە وشەیێکی هاوپێوەندی ، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێ ، کە ئەو پێوەندی‌یە لێکسیکی بێ . دیارە ئێمە دەزانین ، کە واتای لێکسیکی‌و قاڵبی لێکسیکی وشە تاکایەتی‌یە . بەشەکانی هەر بەشە ئاخاوتنێك جیاوازیێکی زۆری لێکسیکی لە نێوانیاندا هەیە . بەوێنە لەنێوان وشەکانی بەشە ئاخاوتنی ناودا وشە هەیە ناوی گیاندارێك دیاری‌دەکا ، وەك : « کچ ، ئازاد ، ئەسپ ، کۆتر ، ماسی ... » ؛ وشە دەبینرێ ناوی بێ‌گیانێك نیشان‌دەدا ، وەك : « بەرد ، چیا ، گوێز ، زەوی ، ترێ ... » ؛ وشە بەرچاودەکەوەی ناوی بیرێك ڕادەگەیەنێ ، وەك : « خەم ، بڕوا ، جوانی ، منداڵی ... » ؛ وشە هەیە ناوی کارێك دیاری‌دەکا ، وەك : « کۆکە ، خۆراك ، کوتەك ، دروومان ... » ... هتد .

---

( ٣ )بەوێنە ، بڕوانە :

أ ) ئا . ئی . گولانۆف ، وشەسازیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٤ .

ب ) ئا . ئا . ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٤٧ .

ح ) ئا . ئی . سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ل ١٠١ .

... و گەلێکی دی .

( ٤ ) ب . ن . گولۆڤین . سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٥ .



منتدى إقرأ الثقافي

وشەکانی « کچ .. بەرد ... خەم ... کۆکە ... » ، کە هەموو ناون لە ڕووی مانای لێکسیکیەوە لەیەکتر دوورن‌و ئەمە بەسە بۆ ڕەت‌کردنەوەی ئەوەی بەشەکانی ئاخاوتن بە گرووپی لێکسیکی لە قەڵەم بدرێن .

دیارە ئەوەش زۆر لەجێی خۆی نی‌یە ، کە بەشەکانی ئاخاوتن بە گرووپی لێکسیکی ــ ڕێزمانی وشە دابنرێ . بەپێی واتــای زاراوەی لێکسیکی ــ ڕێزمانی بێ ، دەبێ هەر بەشە ئاخاوتنێك لە ئەنجامی هاوبەشیی لێکسیکی‌و ڕێزمانی‌یەوە جیاکرابێتەوە . جا ئەگەر وا بێ ، ئەوە دەبێ گشت حاڵەتەکانی ڕێزمانی لەگەڵ مانای لێکسیکی‌دا لێك‌بدرێن ، کە ئەمەش ڕاست نی‌یــە ... دیاری‌کردنی گرووپی لێکسیکی ــ ڕێزمانی سروشتی بەشەکانی ئاخـــاوتن دەشێوێنێ‌و هەڵکەوتی زمان تێك‌دەدا.ڕاست وایە مانای لێکسیکی نەهێنرێتە ناو ئەم کێشەیەوەو سروشتی ڕوونی ڕێزمانیی بەشەکانی ئاخاوتنی پێ لێــڵ نەکرێ ... (٥) لەگەڵ ئەوەشدا لــە کرۆکــی هــەر حاڵەتێــکی ڕێزمانی‌دا کارتێ‌کردنی لێکسیك سەرنج ڕادەکێشــێ . پێکەوە کارکردنــی لــەحەزاتی ڕێزمانی‌و لێکسیکی یەکێکە لــە کێشە هــەرە گرنگ‌و یەکجــار گرانەکانــی زمانناسی . لە زماندا ئەگەرچی حاڵەتی ئەوتۆش هەیە ، کە دەشێ ناوبنرێ لێکسیکی ــ ڕێزمانی ، چونکە خاسیەتی گوێزانەوەیان تێدایە ، لێکسیك بــە ئەشکرا قورسایی دەخاتە سەر ڕێزمان‌و ڕێزمانیش بە ڕوونی کەمتر لە حاڵەتی ئاسایی گۆشەگیر دەبێ . نموونەی ئەم جۆرە حاڵەتی لێسکی‌و ڕێزمانی‌یەش لە زمانی کوردیدا وشەی وەك : « هەنگوین ، ڕۆن،کەرە،ماست،جۆ...»ن، کە واتای بوونی شت بە یەکیانەوە دەبەستێت‌و خاوەنی ئەو تایبەتێتی‌یــە ڕێزمانی‌یەن ، کەحاڵەتی کۆیان نی‌یە . هەروەها وشەکانی « جوانی ، بەرزی ، نزمی ، بڵندی ، گەورەیی ... » ، کە ناوی واتان لایەنی لێکسیکی‌یان تێــدا بەدی دەکرێ ... بەڵام چ ئەم کۆمەڵە وشەیەی ناوی واتاو چ گرووپــەکەی پێشتریش ، بەر لە هەر شت گرووپی ڕێزمانین ، چونکە : ١ ــ لە ڕێگــای پێوەندییانەوە بە بەشەکانی ئاخاوتنەوە جیاکراونەتەوە ( ناون‌و ناتوانن لــەو سنوورە دەرچن ) ؛ ٢ ــ خاوەنی خاسیەتی ئاشکرای ڕێزمانیین ...

بەم چەشنە بەشەکانی ئاخاوتن گرووپی ڕێزمانیین‌و بە هیــــچ چەشنێك گرووپی لێکسیکی یان لێکسیکی ــ ڕێزمانی نین .

دوای ڕوونکردنەوەی ئەوە ، ئەمجا دێینە سەر باسی کێشەی ئــەو شێوازو بنەما زانستی‌یانەی دەبنە ڕێگەی دابەش کردنی بەشەکانی ئاخاوتن . واتە دەبێ بزانین بەر لە هەر شت کام لایەن‌و کام خاسیەتی بەشەکانی ئاخاوتن پێویستە لەبەرچاو بگیرێ ، تاکو دیمەنی زانستیی بەشەکانی ئاخاوتن ڕاست‌و ڕەوان بێتە بەرچاو ، تاکو باشترو تەواوتر وێنەی واقیعی زمان ببینرێ .

---

( ٥ ) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٧ .



منتدى إقرأ الثقافي

له مێژووی زمانناسیدا بۆ دابەش‌کردنی بەشەکانی ئاخاوتن هەوڵی جۆربەجۆر دراوە . بەوێنە هەوڵێ ئەوە دراوە ، کە لەسەر بناغەی ژیربێژی، وشەکانی زمان بەسەر بەشە ئاخاوتندا دابەش‌بکرێن ــ واتە لە ڕێگەی ئەو پێوەندی‌یەوەی کە لە نێوان وشەو مەفهوومدا هەیە . ئەم هەوڵە سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا ، چونکە واتای ڕێزمانیی بەشەکانی ئاخاوتن لەگەڵ مەفهوومدا لە یەك ئاستو ڕاددەدا نین ... ئەو تەقەلایەش دراوە ، کە دابەش‌کردنی بەشەکانی ئاخاوتن لەسەر بناغەی شێوەو ڕێژەی وشە دامەزرێنرێ . ئەم هەوڵەش سەری‌نەگرت ، چونکە دەشێ وشەکانی یەك بەشە ئاخاوتن خاوەنی شێوەو ڕێژەی هەمە چەشن بن(٦) ...

لە زانستی زمانی ئەم سەردەمەدا بە تەواوی ددان بەوەدا نراوە کە لە دابەش‌کردنی بەشەکانی ئاخاوتندا پێویستە شێوازی کۆکردنەوەو وەسف ڕچاوبکرێ‌و داوا لە زانایان کراوە ، چۆن خاسیەتی ناوەوەی واتای وشە بۆ پێکەوە بەستنی وشە لە سنووری یەك بەشە ئاخاوتندا ڕەچاوکراوە ، هەروەها خاسیەتی شێوەی دەرەوەشی لەبەرچاو بگرن ، چونکە ئەمە شتێکی واقیعی‌یە . ئەگەر بەشەکانی ئاخاوتن گرووپی ڕێزمانیی وشە یان حاڵاتی ڕێزمانیی وشە بن ، ئەوە هەر حاڵەتێکی ڕێزمانی ، بریتی‌یە لە یەکێتی واتای ڕێزمانی‌و کەرەستەی شێوەی دەربرینی. کەواتە لە باسی زانستی بەشەکانی ئاخاوتن‌و لێکۆڵینەوەیاندا پێویستە یەکێتی ئەو دوو دیوەی وشە ڕەچاوبکرێ.

بۆ دابەش‌کردنی وشەی جۆربەجۆر بەسەر بەشە ئاخاوتنی جیاوازداو بۆ دیاری‌کردنی ژمارەی بەشەکانی ئاخاوتن‌و بۆ کێشانی سنوور لە نێوانیانداو بۆ تێگەیشتنی جیاوازیی نێوان بەشەکانی ئاخاوتن‌و بۆ زانینی نێزیکی‌یان ، بەر لە هەر شت پێویستە : ا ) بەپێی هەر بەرنامەیێك بێ سەرنج‌و ئەنجامی سەرنج دەربارەی سەر بە چ گرووپێ بوونی وشە لە ڕووی گشتێتی مانای ڕێزمانی‌یەوە دیاری بکرێ ؛ ب ) هەروەها لە ڕێی هەر بەرنامەیەکەوە بێ گشتێتی شێوەی نیشانە ڕێزمانی‌یەکانیش دەستنیشان بکرێ(٧) . ئەم دوو کارە لە پلەی یەکەمی وەسفی بەشەکانی ئاخاوتندا دەور دەبینن . ئەم کارە سەرەکی‌یانە لە لایەن توێژەردوە بە چەند پلە دەگەیەنرێنە ئەنجام ، بەندە بە کۆمەڵێك هۆوە ، بەتایبەتی هەڵبژاردنی بەرنامەی سەرنج‌و شی‌کردنەوەی واقیعی زمان لە لایەن توێژەرەوە. لە ڕاستیدا لە تەقەلای توێژەردا زۆر جار ئەو کارانە یەك‌دەگرن یاخود تێکەڵ دەبن‌و یاریدەی یەکتر دەدەن . دەشێ‌و بۆ لێکۆڵینەوە کەڵکی زۆرە ئەگەر سنوور لە نێوان گشتێتی واتای ڕێزمانی‌و

---

( ٦ ) هەمان سەرچاوە ، ل ١٦٠ .

( ٧ ) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٤٩ .



منتدى إقرأ الثقافي

گشتێتی نیشانەی ڕێزمانیدا نەکێشرێ(٨) .سەرباری ئەوە،بەشەکانی ئاخاوتن لە ڕووی تایبەتێتی گشتێتی دەوری ڕستەسازیو گشێتی وشەڕۆنانیشەوە جیادەکرێنەوە . بۆ نموونە هەموو ناوێك بەر لە هەر شت دەوری نیهاد دەبینێ . ئاوەڵناو ـ دەوری دیارخەر ؛ کردار ـ دەوری گوزارە ... دەگێڕن. ناوی داڕێژراو لە زمانی کوردیدا بە شێوەیێکی سەرەکی بە یاریدەی پاشگر سازدەبێ ، پێشگریش دەوری بنەڕەتیی داڕشتنی کردار دەبینێ(٩) ... بەڵام دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین ، کە خاسیەتی ڕستەسازیو وشەڕۆنان بە تەنیا ناتوانن ببنە ڕێگە بۆ دابەش‌کردنی وشە بە سەر ئەم ، یان ئەو بەشە ئاخاوتندا.

لە زمانناسیی نوێدا لە باسو لێکۆڵینەوەی بەشەکانی ئاخاوتندا تا دێ پتر گرنگی بە پێکەوەبەستنی وشە دەدرێ ـ واتە توانای یەکگرتنی وشەی خاوەن خاسیەتی جیاواز لەگەڵ یەکتردا .

هەموو ناوێکی زمانی کوردی توانستی ئەوەی هەیە ئاوەڵناوێك یان کردارێك بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە . گشت ئاوەڵناوێك بۆی هەیە ببێتە ئاوەڵی ناوێك ... هەر کردارێك دەتوانی بچێتە ژێر باری ناوێکەوە ... پێکەوە بەستنو یەکگرتنی وشەش گەلێ کێشەی زمانەوانی دەرەوێنێتەوە .

ئاشکرایە ، کە بەشەکانی ئاخاوتن وەك یەك نینو لە ڕووی واتای ڕێزمانیو کەرەستەی دەربڕینی شێوەیانەوە جیاوازن ـ واتە لە ڕووی پێکهاتنی ناوەکیەوە ماکەکانی هەر بەشە ئاخاوتنێك یەکدەگرنەوە .

ئایا « ماکەکان »ی بەشەکانی ئاخاوتن‌چین ؟ و « کۆکەرەوە » کەیان چیە ؟

ماکەکانی بەشەکانی ئاخاوتن،بەر لە هەر شت ئەو حاڵەتە ڕێزمانیانەن، کە وا لە ناوەوەی هەر بەشە ئاخاوتنێکدا دەردەکەون . بەوێنە لە زمانی کوردیدا ناو خاوەنی ناسیاویو نەناسیاویو ژمارەو جنسو دۆخ ... ەو ئاوەڵناو ـ چونێتیو خاسیەتو نیشانەو پلە ... کردار ـ کاتو ڕێژەو هێزو داڕشتن ...

« کۆکەرەوە »ی ماك لە دیوی ناوەوەدایەو پێوەندیو کارکردنە سەر یەکترە . ئەم جۆرە کۆکەرەوەیە گەلێ جار بە سیستەم ناودەبرێو مەبەست

---

( ٨ ) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥١ .

( ٩ ) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەوا دەربارەی پێشگر لە داڕشتنی ناودا و دەوری پاشگر بۆ سازکردنی کرداری داڕێژراو لە زمانی کوردیدا، بڕوانە: د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤٩ ـ ٦٤ ، ٧٢ ـ ٧٨ .



منتدى إقرأ الثقافي

پێوەندی نێوان ماکەکانی وشەسازی یان پێکهاتنی زمانی‌یە (١٠) .

بەوێنە لە زمانی کوردیدا پێوەندی‌و بەرانبەر یەکتر ڕاوەستانی کات ، کردار دیاری دەکا . کاتی ئێستا بەرانبەر کاتی ڕابوردووو کاتی ئاینــــدە ڕادەوەستێ . یەکەمیان دەمی ڕوودانی ئاخــاوتنەکە دەگەیەنێ ــ واتە لــەو دەمەدا کە کردارەکە واتای دەگەیەنێ . دووەم‌و سێیەم لە دەمی ئاخاوتنەکەدا نین ، بەڵکو لە دوایەوە یان لە پێشیەوە دێن .

بەشەکانی ئاخاوتن لە ڕووی پێکهاتنەوە لە یەکتر زۆر جیاوازن‌و ئەمەش لە هەموو زمانێکدا بەدی دەکرێ .

لە زمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی ناو ئەو گرووپە وشانەی گرتووەتــە خۆ ، کە لە بنەڕەتدا واتای ڕێزمانیی شتیان تێدایە . ئەم واتایەش بە هــۆی نیشانــەی ناسیــاوی‌و نەنــاسیــاوی‌و ژمــارەو جنس‌و دۆخ ... ەوە دەردەبڕدرێ(١١) . بایەخی ئەو نیشانانە بۆ دەربڕینی نــاو ، ئەوەیە یارمەتیی دەدا بە ئاوەڵناو یان بە کرداری‌یەوە ببەستێ . ناو بەرانبەر جێناوی ( کــێ ) و ( چی ) دەوەستێ .

واتای شت ڕاگەیاندن کــە بۆ بەشە ئاخـــاوتنی ناو ســــەرەکی‌یە ، تایبەتێتی‌یێکــی ڕێزمانی‌یە ، نــەك ژیربێژی . ئەوەی پێشتر خستمانە ڕوو ئەمەمان پێ‌دەسەلمێنێ.واتای شت گەلێ مەفهوومی لەیەکەوە دووری ژیربێژی لە گرووپێکدا کۆدەکاتەوە ، وەك : ئەستێرە ، بۆق ، باوەڕ ...

ئەو پرســیارە ســــەرهەڵدەدات : لــــە ڕێزمــــاندا مەبەســـت لە شـــت چی‌یە ؟ وا دیــارە بابەتی ڕێزمــان ددان بــە هەموو ئەوەدا دەنێ ، کە بیرو هۆشی مرۆڤ دەتوانێ دەرکی پێبکا : چۆنێتی ، خاسیەت ، چالاکی، بارودۆخ ... لە واقیعدا شتێکی ڕاستە ، کە « جوانی » خاسیەتی چۆنێتــی ( شت ) ە . بەڵام ئەمە لە زماندا شتــەو توانستی ئەوەی هەیــە خــاوەنی ( چۆنێتی‌و چالاکی ) بێت . کەوابوو پێویســت بەوە نی‌یــە بگــەڕێین بەدوا گونجاندا لە نێوان واتای ڕێزمانیی شت‌و شــت لــە واقیعی بوونەوەردا . گشتێتی ڕێزمانی گەلێ فراوانترە لە گشتێتی ژیربێژی . دیارە ئەمەش لەبەر ئەوەیە ، کە بابەتی ڕێزمـــانی خاوەنــی سەرچاوەیێکــی واقیعی‌یە ،ئەویش شت‌و کەرەستەی واقیعە . ئەو وشانەی واتای شت ناوەندی واتای بەشــە

---

( ١٠ ) ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ( وشەســـازی ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٨٣ .

( ١١ ) ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٤٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

ئاخاوتنی ناو پێکدێنن(١٢) .

واتا سەرەکییەکانی ڕیزمانیی شت لە بەشە ئاخاوتنی ناودا لە حاڵەتی : ناسیاویو نەناسیاویو ژمارەو جنسو دۆخ ... دا ڕەنگدەداتەوە .

لە زمانی کوردیدا نیشانەی ( ـ ە کە )و ( ـ ە ) بە دوای ناوەوە دەلکێنرێ بۆ ئەوەی بکرێ بە ناسیاو . ئەم دوو نیشانەیە کاتێك دەچنە سەر ناو دەتوانن مانار مەبەستی شتێك ئاشکرا بکەن ، کە لە پێشدا ناوی هاتبێ ، وەك : « ئازاد شیری دایە دەستم ، منیش بە شیرەکە کەوتمە ناویان ... »

بۆ ( ـ ە )ش با سەیری ئەو پارچە شیعرەی پیرەمێرد بکەین :

**پیاوێکی کورد چوو بۆ بەسرا**
**سبەینیان شیری ئەگێرا**
**......**
**مەیموونی قەپتان پەیدا بوو**
**ئەو کیسەی لیرەکەی تیابوو**
**فڕانیو بە دارا هەڵگەڕا**
**کوردە ئارامی لێبڕا**

لە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرەدا ، وشەی « کورد » ناوێکی نەناسراوە ، بەڵام کاتێ لە دوا دێڕدا نیشانەی ( ـ ە )ی ناسیاوی پێوە لکێنرا ، بوو بە ناسراو . بەم جۆرە نیشانەی ناوبراو ، ماناو مەبەستی شتێکی ئاشکرا کردووە ، کە زووتر ناوی هێنراوە .

ئەم نیشانانە هەروەها دەتوانن ناسراوی بەدیاربخەن بەوێنە کە دەوترێ « پیاو هات » ، ئەوە نازانرێ کێیە یان کێن ، لەبەر ئەوەی نەناسێنراوە . هەموو پیاوێك دەگرێتەوە ، بەڵام ئەگەر بوترێ : « پیاوەکە هات » یان « پیاوە هات » ، ئەوە بەدیاردەکەوێو ناسراوە کێیە(١٣) .

ئەو نیشانانەی لە زمانی کوردیدا دەچنە سەر ناو بۆ ئەوەی بیکەن بە نەناسیاو ، ئەمانەن :

لە ناوچەی سلێمانیو موکریان ... دا ( ـ ێك )و ( ـێ ) نیشانەی نەناسیاوین . هەرچی ( ـێ )یە گومانی لێناکرێ کە کورتکراوەو تەخفیفی ( ـ ێك )ە .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو گەلێك ناوچەی سۆراندا ( ـ ەك )

---

( ١٢ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ب.ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ١٦١-١٦٢ .

( ١٣ ) بۆ تەواو ڕوونکردنەوەی ئەو باسە ، بڕوانە : بەشی یەکەمی ، بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ، ل ١٨٧-٢٠٢ .



منتدى إقرأ الثقافي

نیشانەی نەناسیاوی‌یە .

لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی‌ژووروودا ( ن ــ in ) و شێوەکانی تری : (ــن n - ) ، ( ــ نە ine - ) ، ( ــ نە ne - ) هەر بۆ نیشاندانی نەناسراوی بەکاردێن .

تایبەتێتی نیشانەی نەناسیاوی لە زمانی کوردیدا لەوەدایە کە جگە لە نەناسراوی ( مجهولیة ) ، هەروەها تاکایەتی ( افرادیة ) یش نیشان‌دەدا(١٤).

حاڵەتی جنس شتێکی شێوەیی‌یە ــ واتە واتا ڕێزمانییەکەی بۆ پێوەندیی وشەو شت هیچ نیشان‌نادا . ئێمە نازانین چ هێزێك وای کردووە ناوێك بە نێر دابنێین‌و ناوێکی دی بە مێ‌و سێیەم بە بێ‌لایەن ... ئەم هێزە تەنیا چاولێکەری‌یە . دابەش‌کردنی ناو بەسەر جنسدا هیچ وێکچوونێکی لەگەڵ دابەش‌کردنی شت‌و دیاردەی ژیاندا نی‌یە ( تەنیا ناوی مرۆڤ نەبێ ، فراوانتر ناوی گیانداران ) . لەم حاڵەتانەدا جیاوازیی جنسەکانی ناو لە جیاوازیی لێکسیکیی نێرینەو مێ‌ینەدا ڕەنگ دەداتەوە(١٥) . لە گەلێ زمانداو هەروەها لە دیالێکتی ژووروویی کوردی‌و هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووشدا وشەی نێرو مێ‌و بێ‌لایەن ... بە شێوەی دەرەوەیاندا لێك‌جیادەکرێنەوە ، بەتایبەتی بە هۆی ئەو کۆتاییانەوە کە لە دۆخی جیاوازدا وەری‌دەگرن . ئەمە وای کردووە ، کە ئێستا واتای جنس لە گشت ناوێکدا ڕەنگ‌بداتەوە .

لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی‌و هەندێ شوێنی تردا لە مێژە جنسەکانی ناو دەوریان نەماوەو بەرگی سستییان لەبەرکراوە ... بەڵام لە دیالێکتی ژووروو هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووداا هەرچەندە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی جیاکردنەوەی جنس بەسەرچووە ، بەڵام لە ڕستەدا بەتایبەتی لە دۆخێ تیان‌و دۆخی بانگهێشتن‌و دۆخی ئیزافەدا ڕوون‌و ئاشکرا خۆیان دەنوێنن .

لە ناوچەی موکریان‌و سۆران‌و ... تەنانەت هەندێ لە دەوروپشتی سلێمانیش ، ناو ئەگەر نێر بوو لە دۆخی تیاندا نیشانەی ( ــ ی) ی پێوە دەلکێ ، بەڵام کە مێ بوو نیشانەی ( ــێ ) ی دەچێتەسەر .

لە زوربەی دیالێکتی خوارووا لە دۆخی بانگهێشتندا جیاوازی لە نێوان نێرو مێدا دەکرێ . تەنانەت لەناو سلێمانیشدا کۆمەڵێك وشە هەن کە لە دۆخی ناوبراودا ئەو جیاوازییەیان تێدا بەدی‌دەکرێ ، ئەویش ئەوەیە کە بە کۆتاییی ناوی نێرەوە نیشانەی ( ــ ە )و ، بە کۆتاییی ناوی مێوە نیشانەی ( ــ ێ ) دەلکێ .

---

( ١٤ ) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٢ ــ ٢١٦ .

( ١٥ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ب.ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ل ١٦٢ .



منتدى إقرأ الثقافي

له دیالێکتی ژووروودا ، هەروەك له ناوچەی موکریان‌و سۆران‌و هەندێ شوێنی دەوروپشتی سلێمانی ، ناو ئەگەر نێر بوو له دۆخی تیاندا نیشانەی (ـ ی ) ی پێوە دەلکێ ، بەلام کە مێ بوو نیشانەی (ـ ێ)ی دەچێتەسەر .

بەو پێیە ، بینیمان له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا جنسەکانی ناو دەستوورێکی ڕێك وپێکیان ڕەچاوکردووەو له ڕێگەی نیشانەوە له یەکتر جیادەبنەوە . له دۆخی تیاندا جنسی مێ نیشانەی (ـ ێ) وەردەگرێ‌و جنسی نێریش نیشانەی ( ـ ی )ی پێوە دەلکێ . له بەشە دیالێکتی موکری‌و هەندێ ناوچەی سۆران‌و کەمێك له دەوروپشتی سلێمانیدا ، هەرچەندە وەك دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ڕێك‌وپێك خۆیان نانوێنن ، بەلام تا ڕادەیەك دەستووری خۆیان پاراستووە . لەم بەشە دیالێکتانەی خوارووشدا هەر نیشانەی ( ـ ێ ) دەچێتە سەرناوی جنسی مێ‌و ، هەر نیشانەی (ـی) یش ئیزافەی سەر ناوی نێر دەبێ . له زمانی ئەدەبی‌و ئاخاوتنی سلێمانی‌و هەندێ ناوچەی تردا نیشانەی نێرو مێ ( جگە له چەند حالەتێکی زۆر کەم نەبێ ) نەماوە .

له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا له دۆخی بانگهێشتندا جیاوازی لە نێوان نێرو مێدا دەکرێ . ناو ئەگەر له جنسی نێر بوو نێشانەی (ـ ۆ)ی پێوە دەلکێ ، بەلام کە مێ بوو نیشانەی (ـی) ی دەچێتەسەر(١٦). لەم دیالێکتەدا له دۆخی ئیزافەدا نیشانەی (ـا ، ـە) بەدوای ناوی جنسی مێ‌و نیشانەی (ـێ، ـی ) بە ناوی جنسی نێرەوە دەلکێن .(١٧)

حالەتی ژمارە ( تاك‌و کۆ ) بەلگەی واقیعەو نیشانی شتێك دەدا لە بەرانبەر چەند شتێکدا .

ناوی تاك ئەو ناوەیە کە تەنیا کەسێك یان تەنیا شتێك نیشان‌دەدات .

له زمانی کوردیدا فۆرمی ناوی گشتی ، ئەگەر نیشانەیێك یاخود وشەیێکی بۆ دووپاتکردنەوە لەگەڵ نەبێ ، ئەوە چۆن بۆ تاك ، هەر بەو جۆرەش بۆ هەموو ڕەگەزی هاوچەشنەکەی بەکاردێت .

هەرچەندە له زمانی کوردیدا هەندێ نیشانە هەن ، کۆ پێك‌دێنن‌و هەروەها هەندێ حالەت هەن مانای کۆ دەگەیەنن ، بەلام نیشانەی ڕەسەن‌و سەرەکیی کۆی ناو ( ـ ان ) ە .

جگە له ( ـ ان ) هەندێ نیشانەی دیکە هەن ، کە کۆ سازدەکەن ، وەك: (ـ ات) ، (ـ ها) ، (ـ گەل) ... واتە له زمانی کوردیدا (ـ ان) نیشانەیێکی

---

( ١٦ )بڕوانە ئەو باسەی له لاپەڕە ( ١٦٣ ـ ١٨٦ ) ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا دەربارەی جنسەکانی ناو کراوە .

( ١٧ ) هەمان سەرچاوە ، ل ٢١٨ـ٢٥٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

سەرکیو ڕەسەنی کۆیە . نیشانەی (ــ ات)و (ــ ها)و (ــگەل) ... یش لـە پلەی دووەمدا کۆ سازدەکەن .(١٨)

دۆخیش لەگەڵ واقیعدا یەکدەگرێتەوە . ئـەم حاڵەتـە جیـاوازیو پێوەندیی شێوەی چەند دۆخێك ڕادەگەیەنێو سنوور لە نێوان پێوەندیی شت بە شتەوە یان شت بە پرۆتسێســـەوە دەکێشێ . دۆخـــی ڕاستەوخـــۆ سەربەخۆیـــی ڕێزمانیی شت نیشـــاندەدا . تێکڕای دۆخەکانـــی دی ناسەربەخۆیی ڕێزمانییان دەردەبڕن .

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا دەشێ سێ دۆخ بۆ ناو دیاری بکرێ : ( ١ ــ دۆخی ڕاستەوخۆ) ؛ ( ٢ ــ دۆخی تیان )؛ (٣ ــ دۆخی بانگهێشتن). لە کرمانجیی ژووروشدا ئەگەرچی هەر ئەو سێ دۆخە دیارو سەرەکییـە ، بەڵام هەندێ لە نووســـەران چەنـــد دۆخێکی دیشیان دەستنیشـــان کردووە .(١٩)

حاڵاتی ناسیاویو ژمارەو جنسو دۆخ لە دیوی دەرەوەی نـــاودا بەدەردەکەون ، چونکە لە ڕێگای پێوەلکانی نیشانە بە کۆتاییەوە ، دەبینرێ.

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناو لە ڕووی شێوەوە هیچ جیاوازێکی لەگەڵ ناودا نییە(٢٠)و هۆی بنەڕەتیی جیابوونەوەیان تەنیا واتایە . بۆ بینینـــی لەیەکچوونو جیاوازیی پێکهاتنی وشەسازیی نـاوو ئاوەڵناو بە کورتی ئاوڕ لە هەندێ لایەنیان دەدەینەوە :

١ ــ واتای ڕێزمانیی ئاوەڵناو لە واتای ڕێزمانیـــی ناو بە تـــەواوی جیاوازە . دەزانین کە ئاوەڵناو مانای ڕێزمانیی چۆنێتیی شت نیشاندەدا ، نەك واتای خودی شتەکە . واتە ئاوەڵناو هەمیشە خاسیەت و چۆنێتی شت دەردەخا . شت هەمیشە خاوەنی خاسیەتی هەمەچەشـــنە ، خاسـیەتیش هەمیشە « ژێردەستە ، بەندە » ی شتە و ناتوانێ لە هاوەڵەکەی جیاببێتەوە. هەرچی ناوە لە ئاخاوتندا دەتوانێ بە بێ ئاوەڵناو کاربکا ــ واتە شت بەبێ هاوەڵەکەی دەتوانێ واتا بدات . ئاوەڵناو لە ئاخاوتندا بەبێ ســـەرکردەکەی ناتوانێ بژی ؛ ئاوەڵناو پێویستە هەمیشە پەنجە بۆ شتێك ڕابکێشێ(٢١) .

ئەو جیاوازییە دیارەی واتای ڕێزمانیی ئاوەڵنـاوو ناو ، بێ گومـان

---

( ١٨ ) هەمان سەرچاوە ، ل ١٣٧ــ١٦٣ .

( ١٩ ) بڕوانە : ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆســـکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٥٦ــ٨٩ .

( ٢٠ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کـــوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، ل ٧٨ .

( ٢١ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ب.ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناســـی ، ل ١٦٥ــ١٦٦ .



منتدى إقرأ الثقافي

کاردەکاتە سەر دیوی ناوەوەی پێکهاتنیشیان .
٢ ــ ئەگەر ناو لە ڕێی حاڵەتی ناسیاویو نەناسیاویو ژمارەو جنسو دۆخەوە دیاریکرابێو لەم حاڵەتانەشدا بەتایبەتی تەئکید لەسەر سروشتی واتای ڕێزمانی بکرێ ، ئەوە ئاوڵناو لە ڕووی حاڵاتی چۆنێتیو نیسبیەتو پلە ... وە جیاکراوەتەوە .

حاڵاتی چۆنێتیو نیسبیەت بەپێی پێوەندیی چەندێتی لە ڕێگای خاسیەتی ڕێزمانیی پێوانە قبووڵکردن ( توانای گۆڕان ، توانای گۆڕین )و خاسیەتی پێوانە قبووڵنەکردن ( نەگۆڕ ، هەمیشەیی )یەوە دابەشکراوە . لە ڕاستیدا خاسیەتی « گەرم » بەپێی پێوەندیی چەندێتی دەپێورێ . ئەم خاسیەتە لە شتی جیاوازدا لە ڕووی چەندێتییەوە دەشێ وەك یەك نەبێ .

بەڵام ئاشکرا نییە ، چۆن دەکرێ بەپێی خاسیەتی چەندێتی «پۆڵایین»لە شتی جیاواز : « دیواری پۆڵایین » ؛ « بازووی پۆڵایین » ؛ « باوەڕی پۆڵایین » ... دا بپێورێ یان بەراوردبکرێ . دابڕینی زاراوەی « چۆنێتی »و « نیسبیەت » بەسەر ئاوەڵناودا زۆر لەبار نییە ، هەندێ جار دەمانهێنێتە سەر ئەو ڕایەی بڵێین جیاوازیی « چۆنێتی » و « نیسبی یەت » بە هەڵە هاتووەتە ئەم زانستەوە . زاراوەی « چۆنێتی » و « نیسبیەت » ئەو دەمە هێنراوەتە ناوانەوە ، کە ئاشکرا بووە جیاوازیی ڕێزمانی لە نێوان دوو جۆر ئاوەڵناودا هەیە . لە ڕاستیدا زاراوەی « چۆنێتی » بەر لە هەر شت « چەندێتی » خاسیەتەکە نیشان دەدا . لە توانای ئەو خاسیەتەوە بەپێی چەندێتی دەگۆڕێ . زاراوەی « نیسبی یەت » یش نیشانی چەندێتی نادات .(٢٢)

بەپێی حاڵەتی چەندێتی و نیسبیەت ، لە ئاوەڵناودا هەروەها پلەی بەراورد هەیە ( ئەمەش تەنیا بۆ ئاوڵناوی چۆنێتییە ) .

هەرچی حاڵەتی ناسیاویو نەسیاویو ژمارە و جنس و دۆخ ...ی ئاوەڵناوە ، تەنیا لە حاڵەتێکدا بەدەردەکەوێ کە ناوەکە بۆی دیاری بکا ــ واتە مەفهوومی ناسیاوی و نەناسیاوی و ژمارە و جنس و دۆخ ... ی ئاوەڵناو لە ڕێی پێوەندی بە ناوەوە ئاشکرا دەبێ .

سروشتی ڕێزمانیی حاڵەتی ناسیاوی و نەناسیاوی و ژمارە ...ی ئاوەڵناو و ناو زۆر لە یەکتر جیاوازن . ئەگەر لە ناودا جیاوازیی ناسیاویو نەناسیاویو کۆ...دا جیاوازیی خودی شتەکانو پێوەندییان ببینین ، ئەوە لە ئاوڵناودا شتی لەو جۆرە بەدی ناکەین . شێوەی جیاوازی ئاوڵناو هیچ

---

( ٢٢ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ئا . ئی. سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، ل ١٥٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

جیاوازیێك لە نێوان چۆنێتی شت یان پێوەندیی چۆنێتی شت بە شتەوە نیشان نادات . ئەگەر بلێین : « **کچە جوانەکە ؛ کچە جوانەکان** ... » ئایا شێوەی جیاوازی « جوان » هیچ جیاوازیێکی لە خودی چۆنێتی یان پێوەندییاندا هێنایە کایەوە ؟ بێ گومان نەخێر . کەوابوو ئەو نیشانەو حاڵەتانە بۆ هەنو کەڵکیان چییە؟ ئەمە ئەوە نیشادەدا ڕادەپەڕێنن ... بە واتایێکی دی ئاوەڵناو خزمەتی ناو دەکەنو کاری ئەو ڕادەپەڕێنن ... بە واتایێکی دی حاڵەتی ناسیاوی‌و نەناسیاوی‌و کۆ ... لە ئاوەڵناودا سەربەخۆیی ڕێزمانییان نییەو سەرتاپا لەژێر ڕکێفی ناودانو خاوەنی واتای خۆیان نین .

ئەوەتە وا دەردەکەوێ، کە نێزیکی‌ئاشکرا لە نێوان ناوو ئاوەڵناودا هەیەو چ ناوو چ ئاوەڵناو خاوەنی حاڵاتی وێکچوون.بەڵام ئەو نێزیکی‌یە پتر زاراوی‌یە وەك لەوەی واقیع بێ . لە ڕاستیدا لەودیو ئەو لەیەکتر نێزیکی‌یەوە جیاوازیێکی گەورەی شاراوە هەیە ، ئەو شاراوەییەش لە سەر بنەڕەتی جیاوازیی سنووری ڕێزمانی‌یە[٢٣] .

جگە لەوە ئاوەڵناو لە وەرگرتنی نیشانەکانی ناودا سستەو ناتوانێ بە ئاسانی هەموویان وەرگرێ . بەوێنە لە کوردیدا « **کچان** » بە ئاسانی دەوترێ بەڵام « **شینان** » ناوترێ .

ئەگەرچی ئاوەڵناو ناسیاوی‌و نەناسیاوی‌و ژمارەو جنس‌و دۆخی نییە، بەڵام خاوەنی خاسیەتێکی تایبەتی خۆیەتی ، ئەویش بوونی پلەیە . بەم چەشنە لە لایەن وشەسازی‌یەوە پێوەندیی ناوو ئاوەڵناو لەم شێوەیەدا دەردکەوێ : لە سەرێکەوە ناو هەندێ حاڵەتی هەیە ( ناسیاوی ، نەناسیاوی ، ژمارە ، جنس ، دۆخ ... ) ، کە ئاوەڵناو نی‌یەتی . لە سەرێکی دی‌یەوە ئاوەڵناو خاوەنی حاڵەتێکە ( پلە ) کە ناو نی‌یەتی . بەو پێیە بەگشتی ئاوەڵناوو ناو لەو لایەنانەوە لەیەکتر جیادەبنەوە . جا لە ڕێگای ئەو حاڵەتانەوە دەشێ بە ڕوونی ناوو ئاوەڵناو لە یەکتر جوێ‌بکرێنەوە .

لە زمانی کوردیدا کاتێ ناو بە ئاوەڵناوەوە ، یان با بلێین ئاوەڵناو بە ناوەوە دەبەسترێ لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا ( ی ، ە ... ) و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ( ا ، ە ، ێ ، ی ، ێد / ێت ، ین ... ) بەیەکیانەوە دەبەستن[٢٤] .

لە زمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی کردار بەرانبەر ناویش‌و ئاوەڵناویش دەوەستێ.بەشە ئاخاوتنی کردار ئەو وشانە دەگرێتە خۆ، کە واتای ڕێزمانیی

---

( ٢٣ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ئا . ن . گڤۆزدێڤ ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ل ١٤١ .

( ٢٤ ) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە : ( ل ٢١٨ ـ ٢٥٣ ) ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە .



منتدى إقرأ الثقافي

پرۆتسێسان تێدایە ــ واتە ڕوودانو کاری شتێك دەردەخەن . پرۆتسێس واتای بزووتنەوە ، گەشەکردن ، گۆڕان دەگەیەنێ . بەلام بزووتنەوەو گەشەکردنو گۆڕان دەبێ لە کاتێکدا بێ . لەبەر ئەوە کردار واتای ئەو پرۆتسێسە دەگەیەنێ ، کە لە کاتێکدا گەشەی کردووە(٢٥) .

واتا سەرەکی‌یە ڕێزمانی‌یەکانی کردار لە زمانی کوردیدا بریتی‌یە لە : کات ، ڕێژە ، هێز ، داڕشتن ... هتد .

هەموو کردارێکی کوردی خاوەنی قالبی کاتە ــ ئێستا ، ڕابوردوو ، ئایندە . حالەتی کات لە زمانی کوردیدا وا دێتە بەرچاو ، کە ئاسانو ئاشکرا بێت ، بەلام لە ڕاستیدا وائاسانو ئاشکرا نی‌یە .

هەندێ کەرەستەی ئاخاوتنو ئەدەبیاتی کوردی وامان لێدەکەن ، بیربکەینەوە : قالبەکانی کات چ واتایێك دەگەیەنن ؟ بەوێنە ( دوێنی ئەوە بە ڕێگەدا دەڕۆم ، لەپڕ دەبینم ، ئازاد بەرەوپیرم دێ ) ؛ ( ئەگەر سبەینێ ڕۆیشتم . هەر ئەوەندە بزانە پاش چەند ڕۆژێك هاتوومەتەوە ) ... لە ڕستەی یەکەمدا فۆرمی کاتی ئێستا : ( دەڕۆم ) ، ( دەبینم ) ، ( دێ ) ڕوودانێکی ڕابوردوو ڕادەگەیەنێ . لە ڕستەی دووەمدا فۆرمی کاتی ڕابوردوو : (ڕۆیشتم) ، (هاتوومەتەوە) واتای کارێکی ئایندە دەدات... ڕاست نی‌یە لەسەر بناغەی ئەم جۆرە نموونانە بوترێ لە زمانی کوردیدا حالەتی کات لەگەل فۆرمی کاتدا یەكناگرنەوە . ئەم نموونانە تەنیا ئەوە ڕادەگەیەنن، کە نەك هەر لە لێکسیك‌دا، بەلکو لە ڕێزمانیشدا لەگەل مانای حەقیقی‌دا مانای مەجازیش هەیە . فۆرمی کاتی ئێستا لەباری ئاساییدا واتای کاتی ئێستا دەگەیەنێ ، بەلام لەباری نائاساییدا بە مەجاز دەتوانێ کاتی ئایندەو ڕابوردوو دەربڕێ .

وا لە لێکۆلینەوەی ئەوە دێنین ، کە چۆن فۆرمی کات ، مانای مەجازی وەردەگرێو دێینە سەر باسی کێشە سەرەکی‌یەکانی وەك : مانا حەقیقی‌یەکانی چۆنن ؟ حالەتی کات چی ڕادەگەیەنێ ؟ ... حالەتی کات دەرخستنو ، جیاکردنەوەی پێوەندیی نێوان پرۆتسێسێ نیشان‌دەدا ، کە بە فۆرمی کردار لەگەل ئاخاوتن لەبارەیەوە دەردەبڕێ . ئەگەر پرۆتسێسو ئاخاوتن لەبارەیەوە لە یەك کاتدا بن ، ئەوە فۆرمی کاتی ئێستا بەکاردێنرێ ، ئەگەر پرۆتسێس پێش ئاخاوتنەکەی بکەوێ ، فۆرمی کاتی ڕابوردوو بەکاردێنرێ . بێتو پرۆتسێس پاش ئاخاوتنەکەی بکەوێ ، ئەوسا فۆرمی

---

( ٢٥ ) ن . س . ڤالکینا ، د . ێ . ڕۆزێنتال ، م . ئی . فۆمینا ، ڤ . ڤ . تساپکیڤیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٣٦ .



منتدى إقرأ الثقافي

کاتی ئاینده بەکاردێنری .(٢٦)

له نموونەی وەك :«١ ـ ئازاد دەچیٚ بۆ قوتابخانه» ؛ «٢ ـ سبەینیٚ ئازاد دەچیٚ بۆ قوتابخانه » ؛ « ٣ ـ ئازاد چوو بۆ قوتابخانه » ... دا دەبینین له ڕستەی یەکەمدا کردارەکه له یەك کاتدا پرۆتسێسەکەو ئاخاوتن لەبارەیەوە ڕادەگەیەنیٚ . له ڕستەی دووەمدا کردارەکه پێش ئاخاوتن لەبارەیەوە دەگەیەنیٚ . له ڕستەی سێیەمدا کردارەکه پاش ئاخاوتن لەبارەیەوە ڕادەگەیەنیٚ . ئەم واتایانه واتای ڕێزمانیی ئەو سیٚ فۆرمەی کاتی کرداره له زمانی کوردیدا .

له دیالێکتی خوارووی کوردیدا شێوەی کرداری کاتی ئێستاو کرداری کاتی ئاینده وەك یەکن‌و هیچ نیشانەیێك نی‌یه له یەکتریان جیابکاتەوە جیاکردنەوەیان تەنیا واتای ڕستەیه ، یان دیاریکردنی ئاوەڵکردارێکه بۆ ڕوودانەکه . بۆ نموونه :

**١ ـ دەچم بۆ لادیٚ .**

**٢ ـ ئێستا دەچم بۆ لادیٚ .**

**٣ ـ بەیانی دەچم بۆ لادیٚ .**

حاڵەتی ڕێژه که لەگەڵ حاڵەتی کاتدا پێوەندیی پتەوی هەیه ، له گەردانی کرداردا دەوری هەره گرنگ دەبینیٚ.ڕێژه ڕێگەی سەرەکیی پێوەندیی ڕوودانه به واقیعەوە .

له زمانی کوردیدا کردار سیٚ ڕێژەی سەرەکی هەیه :

**١ ـ ڕێژەی ئیخباری .**

**٢ ـ ڕێژەی ئینشائی .**

**٣ ـ ڕێژەی داخوازی .**

هەموو ڕێژەیێکی ئیخباری‌و ئینشائی له دەمی ڕابوردوودا چوار جۆریان هەیه ( ١ ـ ڕابوردووی نزیك ؛ ٢ ـ ڕابوردووی بەردەوام ؛ ٣ـ ڕابوردووی تەواو ؛ ٤ـ ڕابوردووی دوور)و شێوەی پێکهاتنیان بەم چەشنەیه :

---

( ٢٦ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ب.ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، ل ١٧٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

| کردار | | ڕێژەی ئیخباری | ڕێژەی ئینشائی |
|---|---|---|---|
| ١ ـ ڕابوردووی نزیك | تێپەڕ | من کردم ، تۆ کردت، ئەو کردی، ئێمە کردمان ، ئێوە کردتان ، ئەوان کردیان | من کردبـام ( کردبم ) ، تۆ کردبـات ( کردبت ) ، ئـەو کردبای ( کردبێ ) ، ئێمە کەوتباین ( کەوتبین ) ، ئێـوە کردباتان ( کردبتان ) ، ئەوان کردبایان ( کردبیان ) . |
| | تێنەپەڕ | من کەوتم ، تۆ کەوتـی ، ئەو کەوت ، ئێمە دەمانکرد ، ئێوە دەتانکرد ، ئەوان کەوتن . | من کەوتبام ( کەوتبم ) ، تۆ کەوتبایت ( کەوتبیت ) ، ئەو کەوتبا ( کەوتبێ ) ، ئێمە کەوتباین ( کـەوتبین ) ، ئێـوە کەوتبان ( کەوتبن ) ، ئەوان کەوتبـان ( کەوتبن ) . |
| ٢ ـ ڕابوردووی بەردەوام | تێپەڕ | من دەمکرد، تۆ دەت‌کرد، ئەو دەی‌کرد، ئێمە دەمانکرد ، ئێوە دەتانکرد ، ئـەوان دەیانکرد . | من بمکردایە ، تۆ بتکردایە ، ئـەو بیکردایە ، ئێمە بمانکردایە ، ئێـوە بتانکردایە ، ئەوان بیانکردایە . |
| | تێنەپەڕ | من دەکەوتم ، تۆ دەکەوتیت ، ئـەو دەکەوت ، ئێمە دەکەوتین ، ئێـوە دەکەوتن ، ئەوان دەکەوتن . | من بکەوتمایە ، تۆ بکەوتیتایە ، ئـەو بکەوتایە ، ئێمە بکەوتینانە ، ئێـوە بکەوتنایە ، ئەوان بکەوتنایە . |

منتدى إقرأ الثقافي

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣ – ڕابوردووی تەواو | تێپەر | من كردوومه ، تۆ كردووته ، ئــەو كردوویه ، ئێمه كردوومانه ، ئێــوه كردووتانه ، ئەوان كردوویانه . | من كردبێتم ، تۆ كردبێتت ، ئــەو كردبێتی ، ئێمه كردبێتمان ، ئێــوه كردبێتتان ، ئەوان كردبێتیان . |
| | تێنەپەر | من كەوتوومه ( كەوتووم ، كەوتیمه ) ، تۆ كەوتوویته ( كەوتوویت ، كەوتیته ) ئەو كەوتووه ( كەوتووه ، كەوتیـیه ) ، ئێمه كەوتووینه ( كەوتووین ، كەتینه )، ئێوه كەوتوونه ( كەوتوون ، كەتینه ) ، ئەوان كەوتوونه ( كەوتوون ، كەتینه ). | من كەوتبێتم ( كەوتبم ) ، تۆ كەوتبێتی ( كەوتبی ) ، ئەو كەوتبێ ( كەوتبێ ) ، ئێمه كەوتبێتین ( كەوتبین ) ، ئێــوه كەوتبێتن ( كەوتبن ) ، ئەوان كەوتبێتن ( كەوتبن ) . |
| ٤ – ڕابوردووی دوور | تێپەڕ | من كردبووم ، تۆ كردبووت ، ئــەو كردبووی ، ئێمه كردبوومان ، ئێــوه كردبووتان ، ئەوان كردبوویان . | من كردبوومایه ( كردبمایه ) ، تــــۆ كردبووتایه (كردبتایه) ، ئەو كردبوویایه ( كردبیایه ) ، ئێمــه كردبوومانایــه ( كردبمانایه ) ، ئێوه كردبووتانایــه ( كردبتانایه ) ، ئەوان كردبوویانایــه ( كردبیانایه ) . |
| | تێنەپەڕ | من كەوتبووم ( كەتبووم ) ، تــــۆ كەوتبوویت ( كەتبوویت ) ، ئــەو كەوتبوو ( كەتبوو ) ، ئێمه كەوتبووین ( كەتبووین ) ، ئێوه كەوتبــــوون ( كەتبوون ) ، ئەوان كەوتبــــوون ( كەتبوون ) . | من كەوتبوومایه ( كەتبوومایه ) ، تــۆ كەوتبوویتایه ( كەتبووتایه ) ، ئــەو كەوتبووایه ( كەتبووایه ) ، ئێمــــه كەوتبووینایه ( كەتبوونایه ) ، ئێــوه كەوتبوونایه ( كەتبوونایه ) ، ئــەوان كەوتبوونایه ( كەتبوونایه ) . |



منتدى إقرأ الثقافي

ڕێژەی داخوازیش ، ئەوەیە قسەکەر ــ کەسی یەکەم ــ داوا لە گوێگر ــ کەسی دووەم ــ بکات کارێك یان حاڵەتێك بهێنێتە دی یان بەجێی بێنێ ، دوای کاتی ئاخاوتن .

ڕێگەی پێکهاتنی کرداری داخوازیش لە زمانی کوردیدا بەم جەشنەیە :

ب + ڕەگی کردار + جێناوی لکاوی کەسی دووەم .

حاڵەتی هێز کە مەبەست کارتێکردنی کرداره لە تێنەپەڕو تێپەڕدا کۆدەبێتەوە . کرداری تێنەپەڕ بە تەنیا لە ڕستەدا مانایێکی تەواوی هەیەو ئەنجام بە دەستەوە دەدات ــ واتە پێویستی بە بەرکار نییە . هەرچی کرداری تێپەرە بە تەنیا لە ڕستەدا مانایێکی تەواو نادات بە دەستەوە و پێویستی بە وشەیێکی ترە ماناکەی تەواو بکات ــ واتە پێویستی بە بەرکار هەیە بۆ تەواوکردنی واتاکەی .

هەرچی دارشتنە ، کە دارشتنی کرداری کارا دیار و کرداری کارا بزر دەگرێتەوە ، لە زمانی کوردیدا دەچێتە ژێر باسی کرداری تێپەڕەوە ، چونکە لە کرداری تێنەپەڕ کارا بزر دانارێژرێت .

چۆن لێکۆڵینەوە لە حاڵەتەکانی هەر بەشە ئاخاوتنێك ئەرکی وشەسازییە ، هەروەها باسی پێوەندیی حاڵەتە سەرەکییەکانی بەشە ئاخاوتنەکان لەگەڵ یەکتردا ، بۆ نموونە ( ناو و ئاوەڵناو ؛ ناو وکردار ؛ کردارو ئاوکردار ؛ کردار و ئاوەڵناو ؛ ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار ... هتد ) لە کاری وشەسازیدا پێویستە .



منتدى إقرأ الثقافي

## ــ ١ ــ

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی
# ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی
# « ئاوەڵناو » دا کراون

لە نێو زمانەوانانی کورددا بەر لە هەر کەس مامۆستا سەعید صدقی کابان لە کتیبی « مختصر صرف و نحوی کوردی »دا بەناوی « صفت »ەوە لەو کێشەیە دواوە ...(١) لەم نووسراوەدا باسی ئاوەڵناو بە پێناسەیێك دەست پێ کراوە ، کەدەڵێ : « صفت ــ اسمیکە حال و شان اسمەکەی پێش خوی بیان‌دەکا . بەو اسمە دەڵین موصوف ، بە هردوکیان دەلین ترکیب توصیفی » ( ل ٢٥ ) . ئەگەرچی ئەم پێناسە هەندێ ناتەواوی تێدایە و زۆر تەواو نییە ، بەلام لە گەلێك لەو پێناسانەی لەم ساڵانەی دواییدا بۆ ئاوڵناو دانراون ڕاستترو لەبارترو گونجاوترە .

بەدوا ئەو پێناسەیەدا کەمێك لە دیارخراو ( کەئەو « موصوف »ی پێ وتووە ) دواوە ( ل ٢٥ ) و ئەوەی ڕوون کردۆتەوە ، کە چۆن بە یاریدەی نیشانەی (ــی ) بە دیارخراوەوە دەبەسترێتەوە و سێ حاڵەتی دیاری‌کردووە:

١ ــ « موصوف دائما ژێردار دەبی بشرطی اخر حرفەکەی لە حرفان املا نەبی . وکو ( قلم دریژ ، کاغد سپی ، مندال زیرك ، او سارد » ( ل٢٥) .

واتە ــ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە هەر دەنگێکی نەبزوێن بێ ، ئەوە کورتە بزوێنی ( ــ ی ) دەچێتە سەر ، وەك : ( قەڵەمی درێژ ؛ کاغەزی سپی؛ منداڵی زیرەك ؛ ئاوی سارد ) .

٢ ــ « واگر اخر حرف موصوف لە حرفان املا بو لە باتی ژیر ( ی ) دادەنری . بەو ( ی ) یە دەلین ( ی ) ی وصفی وکو بە ژیرەکە دەلین وصفی. وکو ( بالای بەرز ، بەروی شیرین . تریی سپی ، تختەی رش » ( ل ٢٥ ).

---

( ١ ) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨، ل ٢٥ ــ ٢٧



منتدى إقرأ الثقافي

واته ــ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێنی ( ا ، وو ، ێ ، ی ) بێت ، ئەوە بزوێنی ( ی ) دادەنرێ .

٣ ــ « لکن اگر اخر حرف موصوف ( ی ) ی راست بو وکو ( شوتی ، تروزی ) بۆ خاتری سوکی ( ی )ی وصفی پیوه نانوسینری . وکو ( شوتـی سور ، تروزی ناسك » ( ل ٢٥ــ٢٦ ) .

واته ــ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێنی (ی) بێت ، ئەو کاتە نیشانەی ئیزافەی (ــی) لە تەلەفوزدا دەرناکەوێ .٪

ئەگەرچی مامۆستا سەعید صدقی کابان تەنیا باسی نیشانەی (ــی) کردووەو بە لای ئەو نیشانانەی تردا نەچووە کە دیارخەرو دیارخراو بـــە یەکەوە دەبەستن بەلام دەبێ ئەو ڕاستییە لەیاد نەکەین باش بۆ مەسەلەکە چووەو بۆچوونەکەی لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ ... ئەوەی لێرددا جێگەی ڕەخنە بێ ، تەنیا دوو سەرنجە کە لە بەشی دووەمی ئـــەم باسەی پەیدا دەبێ :

١ ــ نووسەر وای داناوە ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێن بێت، بزوێنی (ی) وەردەگرێ . بەڵام لە ڕاستیدا وا نییەو نیشـــانەکە دەبێتـــە ( ی Y ) ، نەك ( ی ــ I ) .

( ی ــ لا ) ، نەك ( ی ــ ژ ) .

٢ ــ نموونە بۆ دیارخراوی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ۆ) نەهێنراوەتەوە.

مامۆستا سەعید کابان بەدوا ئەمەدا ، ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە « موصوف چە مفرد ، چە جمع بی صفت هر مفرد دەبی . وکو ( مندال زیرەك ، مندالان زیرەك ) و نابیژری ( مندالان زیرەکان ) » ( ل ٢٦ ) ... ئەگەرچی ئەمە وایــە بەڵام نووسەر دەبوو پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشێ ، کاتێ دیارخراو بە یاریدەی (ــە) بە دیارخەردوە دەبەسترێت ، دیارخەرەکە ــ واتە ئاوەڵناوەکە دەبێتە کۆ (٢) . وەك :

---

( ٢ ) ئەگەر دیارخراو بە یاریدەی ( ــ ە ) وە بە دیارخەرەوە ببەسترێ ، ئەو دەمە نەك هەر نیشانەی کۆ ، بەڵکو هەموو نیشانەکانی تریش هەر بە دیارخەردوە دەنووسێن و دیـــارخراو هەرگیز وەریانناگرێ . وەك :

أ ــ نیشانەی ( ــ ە کە ) . بەوێنە :

**کچە جوانەکە ؛ کورە ئازاکە ...**

ب ــ نیشانەی ( ــ ێك ) . بە وێنە :

**بێچوە عەییارێك ...**

حـ ــ نیشانەی ( ــ ە کە + ا ن ) . بەوێنە :

**ئەستێرە بەرزەکان ؛ بەرخە بچکۆلەکان ...**

... هتد .

بەڵام بێتو دیارخراو بە یاریدەی ( ی ) یەوە بە دیارخەرەوە ببەسترێ ،



منتدى إقرأ الثقافي

هەڵووژە کاڵەکان لە دارەکە کەوتنە خوارەوە .

لەبارەی جۆرەکانی ئاوەڵناویشەوە نووسیویە : « صفت ـ دو قسمە (١) سماعی . (٢) قیاسی » و ئنجا بەجیا باسی هەر یەکێکیانی کردووە و لە پەیدابوونیان دواوە و پێناسەی بۆ داناون ... ( ل ٢٦ ) . ڕەنگە ناونانی جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی زاراوەوە پڕبەپڕی خۆی نەبێ ، بەڵام لە دابەش‌کردن و ڕۆنان‌و پێناسە بۆ دانانیاندا بەگشتی سەرکەوتووە و بەپێی هەڵکەوتی زمانی کوردی باسەکەی دارشتووە .

لە کۆتاییشدا بەکورتی لە پلەی بەراوردو پلەی باڵا دواوەو بۆ پلەی بەراورد ، کە ئەو ( صفت تفضیلی)ی ناوناوە ( ـ تر )ی دیاری‌کردووە . بۆ پلەی باڵاش ، کە ئەو بە ( صفت عالی)ی ناوبردووە ( ـ ترین)ی دەستنیشان کردووە .

بەگشتی ئەو چەند لاپەڕەیەی خاوەنی کتێبی « مختصر صرف و نحوی کوردی » لەبارەی ئاوەڵناوەوە نووسیوێتی لەگەڵ کەمی‌و باس‌نەکردنی هەندێ کێشەی گرنگ‌و بوونی چەند ناتەواواویشدا نرخ‌و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە .

زانای گەورەو مەزنی کورد ـ مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » دا لەژێر سەرناوی « سفەت » دا کۆڵیوەتەوە(٣) لە سەرەتادا پێنج جۆر ئاوەڵناوی دیاری کردووە : « ١ ـ سفەتی چۆنی ؛ ٢ ـ سفەتی نیشانی ؛ ٣ ـ سفەتی ژمارەیی ٤ ـ سفەتی موبهەم ؛ ٥ ـ

---

ئەوە تەنیا لە حاڵەتێکدا نیشانەکان دەچنە سەر دیارخەر ( ئاوەڵناوەکە ) ، کە دەوری ( مضاف الیە ) ببینێ . وەك :

**کوڕی ئازاکە**
**کوڕی ئازایێك**
**کوڕی ئازایان**
**کوڕی ئازاکان**

لێرەدا کە ئاوەڵناوی ( ئازاکە ، ئازایێك ، ئازایان ، ئازاکان ) بەدوا وشەی ( کوڕی ) دا هاتووە دەوری ( مضاف الیە ) ی بینیوە ، هۆی ئەوەیە کە بە مەبەست ( کەسێك ) ە ( ئازایە ) یەو ئەو ناوەی بەردەمی کە وەسفی دەکا لابراوە .

( ٣ ) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ٦١ ـ ٨١ .



منتدى إقرأ الثقافي

سفەتی پرسی » و دوایی لە هەر یەکێکیان بە دوورو درێژی دواوە .

نووسەر باسی جۆری یەکەمی ئاوەڵناوی بە سەرباسی « وەزیفەکانی سفەتی چۆنی » دەستپێکردووە ( ل ٦٢ ) و دوو ئەرکی : « ١ ــ ئەبێتە تەواوکەری ناو ... ٢ ــ ئەبێتە تەواوکەری باسی نانەواو » بۆ دەستنیشان کردووە ...(٤) بەدوا ئەمەدا بە چەند دێرێك دەربارەی هاتنی ئاوەڵناوی چۆنێتی بەدوا ناودا دواوەو ئەوەی وتووە کە ناوەکە(ــی)ی ئیزافە وەردەگرێ ( ل ٦٢ ــ ٦٣ ) . لەژێر سەرباسی « ئەداتی تەعریف لەگەڵ ناوی بە سفەت تەواوکراوا » ( ل ٦٢ ) دا لە دوو حاڵەت دواوە . حاڵەتی یەکەم ، کە دەڵێ: « ئەداتی تەعریفی موبهەمی ( ێك ) ڕاستەوخۆ ئەخرێتە دوای ناوەکەوە ، وەکو : مناڵێکی زیرەك ... » لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوە . بەڵام حاڵەتی دووەم ، کە نووسیویەتی : « بۆ ئەوە کە ناوێکی بە سفەت تەواوکراو بە ئەداتی تەعریفی مەعیەن تەعریف بکرێ ئەبێ لە پێشا بخرێتە شکڵی ناوی لێکدراوەوە ، ئەمجا ئەداتەکەی تەعریفیان لەسەر دابنرێ، وەکو : مناڵە زیرەکەکە » . ئەگەرچی ڕاستە نموونەی وەك « مناڵە زیرەکەکە ... » لە شێوەی پێکهاتنی ناوی لێکدراوی ، وەك « گوڵەباخ... » دەچێ ، بەڵام نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە (ە) ی نێوان« گوڵ » و « باخ» ناوبەندەو هەرچی ( ە ) ی دوای « مناڵە » نیشانەی ئیزافەیە . ڕاستتر وابوو مامۆستا وەهبی چۆنێتی هاتنی نیشانەی ناسیاویو نەناسیاوی لەگەڵ ناوی بە ئاوەڵناو تەواوکراودا ببەستایە بە جۆری بەکارهێنانی نیشانەکانی ئیزافەوە.

نووسەر لە باسی « گەڵکردنەوەی ناوی بە سفەت تەواوکراو » ( ل ٦٤ ) یشدا وای داناوە ، کە « مناڵە زیرەکەکان ... » شێوەی ناوی لێکدراوە .

لەژێر سەرباسی « دروستکردنی سفەتی چۆنی » دا لە ڕۆنانی ئاوەڵناو دواوەو شایانی باسە ، کە سێ جۆر ( سادە ، داڕێژراو ، لێکدراو)ی دیاریکردووە ( ل ٦٤ ــ ٧٠ ) .

لە بەشی ئاوەڵناوی داڕێژراودا ، کە ئەو « سفەتی دروستکراو »ی پێوتووە وای باسکردووە کە « ئەتوانرێ لە ناوو فیعل هەندێ سیفەتی

---

( ٤ ) ئەگەرچی ئەرکەکانی ئاوەڵناو لەوە زیاترە ، کە مامۆستا تۆفیق وەهبی لێیدواوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە لە ڕووی وشەسازییەوە دەڕوانێتە ئاوەڵناو ، بۆیە لەو بارەیەوە هیچ تێبینیمان دەرنەبڕیوە .



منتدى إقرأ الثقافي

چۆنی پەیا بکرێ » ( ل ٦٤) و دواتریش هەندێ لەو پاشگرانەی دەستنیشان کردووە ، کە دەچنە سەر ناو یان کرداری سادەو دەیانکەنە ناوو ئاوەڵناوی دارێژراو ... لەم باسەدا سێ ناتەواوی بەرچاو دەکەوێ :

١ ــ نووسەر وای یادداشت کردووە ، کە تەنیا لە ناوو کردار دەتوانرێ ئاوەڵناوی دارێژراو رۆبنرێ ، بەلاّم وەك ئاشکرایە ، لە ئاوڵناوو ئاوەڵکرداریش سازدەکرێن (٥) .

٢ ــ ئەگەرچی باسی بەشێکی زۆر لەو پاشگرانە کراوە ، کە یاریدەی رۆنانی ئاوەڵناوی دارێژراو ددەن ، بەلاّم چەند پاشگرێکی زۆر چالاك هەن ناویان نەبراوە(٦) .

٣ ــ راستە لە رۆنانی ئاوڵناوی دارێژراودا پاشگر دەوری سەرەکی دەبینێ ، بەلاّم پێشگریش ( ئەگەرچی کەمتر ) دەورێکی دیار دەبینێ (٧)و کەچی مامۆستا وەهبی ئەوەی یادداشت نەکردووە .

نووسەر دوا بە دوای باسی ئاوەڵناوی دارێژراو لە « دروست بوونی سفەتی چۆنی لێکدراو « ( ل ٦٨ ــ ٧٠ ) دواوەو زوربەی شێوە پێکهاتنە جۆربەجۆرەکانی ئاوەڵناوی لێکدراوی دەست نیشان کردووە . ئەگەرچی ئەم باسە لەسەر بناغەی کەرەستەیێکی تێر و بەر فراوانی زمانی کوردی بنیاتنراوەو سەرکەوتووە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا دوو تێبینی هەیە ، کە ناکرێ نەخرێنە بەرچاو :

١ ــ نووووسەر وشەکانی « نارێك ، ناپاك » ؛ « بەدەس » ؛ « بێ‌کەس »؛ « هاودەنگ » یشی بە ئاوەڵناوی لێکدراو داناوە ، بەلاّم دەبینین ، ئەو وشانە لە پێشگرێك و وشەیێکی واتادار پێکهاتوون . جا کەواتە ئاوەڵناوی دارێژراون . هەرچی ئاوەڵناوی لێکدراوە وەك مامۆستا وەهبی خۆیشی لە پێناسەکەیدا وتوویە : « ئەو سفەتانەن کە لە دوو یان لە دوو پتر کەلیمە دروست بوون » ( ل ٦٧ ) .

٢ ــ چەند شێوە پێکهاتنێکی دیارو ئاشکرای ئاوەڵناوی لێکدراو باس نەکراوە(٨) .

لە لاپەڕە ( ٧٠ــ٧١) دا لەژێر سەرباسی « سفەتی چۆنیی بچووك‌کراو »دا

---

( ٥ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٨٣ ــ ٨٤ ، ٨٥ ــ ٨٦ )ی ئەم کتێبە .
( ٦ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٧٧ ــ ٨٦ )ی ئە نووسینە .
( ٧ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٧٦ ــ ٧٧ ، ٨٣ ، ٨٤ ــ ٨٥ )ی ئەم بەرهەمە .
( ٨ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٨٦ ــ ٩٠ )ی ئەم کتێبە .



منتدى إقرأ الثقافي

باسی هەندێ لەو پاشگرانە کراوە کە بۆ بچووككردنەوە یان گەیاندنـــــی واتای نازداری بەکاردەهێنرێن ... ئەم باسە دەبـــوو بخرێتـــە نێـــو باسی ئاوەڵناوی دارِێژراوەوە ، چونکە تێکرِای ئەو نموونانەی نووسەر هێناوی‌یەتەوە بوونەتە ئاوەڵناوی دارێژراو ... دواتر کێشـەی « سفەتی چۆنیی وەکو نـاو بە کەڵك ئەهێنرێ » ( ل ٧١ ) بە چـەند دێرِێك باس کراوەو ئەمجا بەنـاوی « پایەکانی مەعنـای سفەتی چـۆنی » ( ل ٧١ ـ ٧٢ ) ەوە لەمـەرِ پلەکانـی ئاوەڵناوەوە کۆڵراوەتەوە . ناتەواوی هەرە دیاری ئەم باسە لەوەدایە ، کـە ناوی نیشانەی ( ـ تر + ین )ی ئاشکراو دیاری پلەی باڵا نەهێنراوە ...

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە لاپەرِە ( ٧٢ ) دا لە باسی ئاوەڵناوی چۆنێتی بووەتەوەو لە لاپەرِە ( ٧٣ ) ەوە کەوتۆتـە لێدوان لەو چوار جـۆرەی تـری ئاوەڵناو ، کە لە سەرەتادا ناومانبردن ... لێرەدا نامەوێ لەو باسانە بدوێم، چونکە زوربەی زۆری نموونەکانی ئەو چوار جۆرەی دی ، کە نووسەر بـــە ئاوەڵناوی داناون ، رِوونو ئاشکرا دیارن ، کە بەشە ئاخاوتنی جێناو یـــان ژمارەن . جا لەم شوێنەدا مەودای ئەوە نی‌یە چەندین لاپەرِە بە رِەتکردنەوەی ئەو بۆچوونانەوە رِەشبکەمەوە .

ئەگەرچی ئەو جۆرە ناتەواوی‌یانەو هەندێکی‌تر لە نووسراوی ناوبراودا بەدی دەکرێن ، بەڵام ئەمانە بایەخی ئەو کارە کەم ناکەنەوەو وێرِای ئەوەش رِووە باشەکەی هەموو کەمو کورتی‌یەکانی شاردۆتەوە .

مامۆستـا نووری عەلی ئەمیـن لەو کتێبەیـدا کە بە ناوی « رِێزمانی کوردی » یەوە بڵاوی کردۆتەوە(٩)لەژێر سەرباسی(ئاوەڵناو ) دا لەو کێشـەیە دواوەو ئەمیش وەك مامۆستا تۆفیق وەهبـی بەسـەر پێنج جۆردا دابەشی کردووە : « ١ ـ ئاوەڵناوی خەبەری ٢ ـ ئاوەڵناوی ئیشاری ؛ ٣ ـئاوەڵناوی فرمانی ٤ ـ ئاوەڵناوی چەندی ؛ ٥ ـ ئاوەڵناوی پرسیاری » .

نووسەر لە سەرەتادا لە ئاوەڵناوی چۆنێتی ( کـە ئەو ـ ئاوەڵنـاوی خەبەری ـ پێ‌وتووە ) دواوە . پاش پێناسەکردنی بەسەر سادەو لێکدراودا دابەشی‌کردووە ... وا چەند کەمو کورتـی‌یێکی ئەم بەشە دەخەینە رِوو :

خاوەنی ئەم بەرهەمـە ئاوەڵنـاوی دارِێـژاوو لێکـدراوی وەك یـەك تەماشاکردووەو لە یەکتری جیانەکردونەتەوە . بەوێنە هەندێ ئـاوەڵناوی دارِێژراوی بە لێکدراو داناوە ، وەك : « بەهێز ، بەجەرك ، بەگورِ ... نەمر ، نەخـۆر ... نارِەسەن ، نارِێك ... بێ‌هـێز ... بەختیار .. تەقلەبـــاز

---

( ٩ ) نووری عەلـی ئەمین ، رِێزمانـی کـوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١١ ـ ١٤١ .



منتدى إقرأ الثقافي

... نوێژکەر ... ( بڕوانە : ل ١١٢ — ١١٣ ) .

هەرچەندە نووسەر زوربەی زۆری ئەو حاڵەتانەی ئاوەڵناوی ناسادەیان لێ پەیدادەبێ یادداشت کردووە ، بەڵام هەندێ حاڵەتی ئاشکراو گرنگ هەیە تۆماری نەکردووە ... وێڕای ئەوە لە دیاریکردنی بەشە پێکهێنەکانی هەندێ وشەی ناسادەدا هەڵە دەبینرێ . بەوێنە وای دانـاوە ، گـوایا وشەکانی « دوودڵ ... چوارچـاو » ( ئاوەڵنـاو + نـاو ) پێکهاتـوون ( ل ١١٢ ) . ئاشکرایە ( دوو ... چوار ) بەر لە هەموو شتێك ژمارەن . دەربارەی وشەی « بێهێز » وای ڕاگەیاندووە ، کە لە ( ئـاوەڵکردار + ئاوەڵنـاو ) ڕۆنراوە ( ل ١١٣ ) . ( بێ ) بە ڕەسەن پێشبەندەو لێرەدا بووە بە پێشگرو هەرگیـز نـە دەبێـتە ئاوەڵکردارو نـە دەوری ئاوەڵـکردار دەبینـێ . هەرچـی وشەی « هێز »یشە ناوە ، نەك ئاوەڵناو . کەواتە وشەی « بێهێز » لـە ( پێشگر + ناو ) پێکهاتووە ، نەك لە ( ئاوەڵکردار + ئاوەڵناو ) ... هتد .

بەدوا ئەو باسەدا ئنجا لەبارەی « پلەکـانی ئاوەڵناوی خەبەری » یەوە دواوەو بەسەر سێ پلەی ( چەسپیو ، بەراورد ، بـاڵا )دا دابەشی کردوونو پێناسەی بۆ داناون و شەرحی کردوونو نموونەی بۆ هێناونەتەوە ( بڕوانە : ل ١١٤ — ١١٥ ) . ئەم بەشە تێکڕا زانستییانەو سەرکەوتووەو تەنیا کـەمێ ناتەواوی لە هەندێ پێناسەو نموونەدا بەرچاودەکەون .

کاتێ نووسەر هاتۆتە سەر باسی ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی چۆنێتی ، دەبینین ( ٢٣ ) پاشگری دیاری کـردووە ( ل ١١٦ — ١٢٠ ) ... ناتەواوی ئەم بەشە بریتییە لە :

١ — ناونەبردنی هەندێ پاشگر ، وەك ( — ەمەنی : ساردەمەنی ... ) ( — اك : ڕووناك ... ) ... هتد .

٢ — هەڵەکردن لە دیاریکردنی شێوەی هەندێ پاشگردا . بە نموونـە نووسەر ( — ی ) و ( — یی ) بـە دوو پاشگر داناوەو وشـەی « هەژرای »و « ئازایی » بە نموونە بۆ هێناوەتـەوە . بەڵام وەك ئاشکرایە ، ئەمـانە یـەك پاشگرن ، کە ئەویش ( — ی )ە . حاڵەتـی دووەمیـان ئەوەیە کە بەپێـی دەستووری فۆنەتیکـی کوردی نیمچەبزوێنێك لە نێوان دوو بزوێنـــدا پەیدابووە ...

٣ — دانانی وشەکانی « چڵك ، شەرم » بە ئاوەڵناو ... هیچ گومـان لەوەدا نییە ، کە ئەو وشانە ناون .

٤ — لە زمانی کوردیدا جگە لە پاشگر چەند پێشگرێکیش هەن دەچنـە سەر ئاوەڵناو(١٠) و نووسەر بە هیچ چەشنێك ناوی نەبردوون .

---

(١٠ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٨٣ )ی ئەم نووسینە .



منتدى إقرأ الثقافي

...و هەندێکی تر .

مامۆستا نووری‌عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٢١) دا بە ناوی « ئەرکی ئاوەڵناوی خەبەری چی‌یە لە ڕستەدا ؟ » دواوەو لە لاپەڕە (١١٢)ەوە هاتۆتە سەر باسی ئەو چوار جۆرەی تری ئاوەڵناو ، کە لە سەرەتادا ناومان بردن ... لەبەر ئەوەی لێدوان لە « ئەرکی ئاوەڵناو لە ڕستەدا » دەچێتە بەشی ڕستەسازی‌یەوەو زوربەی هەرە زۆری باسی ئەو چوار جۆرەی تری ئاوەڵناویش ، کە نووسەر کردوویەتی ، پێوەندی بە ئاوەڵناوەوە نی‌یە ، بۆیە هەڵیان دەگرین بۆ شوێنی پێویستی خۆی ...

لەگەڵ نیشاندانی ئەو ناتەواوی‌یانەشدا ، ڕاست وایە ، ئەوە لەیاد نەکەین ، کە بەرهەمەکانی مامۆستا نووری عەلی ئەمین تاکو ئەمرۆ نرخ‌و بایەخیان بەردەوامەر هێشتا هەر لە ڕیزی پێشەوەن .

نووسەری کتێبی « آوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی »(١١) لە لاپەرە (٢٩ـ٣٠) دا بە ناوی « پەسن » ەوە بە چەند دێڕێك لە ئاوەڵناو دواوە . لە سەرەتادا بە پێناسەیێك دەستی پێ‌کردوە ، کە دەڵێ : «پەسن : ئەوە کو بۆی پەسنێ ( کەس) یان ( تەبا ) یان ( تشتکی تێ‌کردن ، وەك : بارامێ (سۆر)، گای (ڕەش) ... » . بەدوا ئەمەدا «پەسن» دەکا بە دوو بەشەوە : «١ـ پەسنێ ڕاستی ٢ ـ پەسنێ چێکروخی » . بۆ « پەسنێ ڕاستی » چوار جۆری دیاری‌کردووە : « ١ ـ تام : شۆر ، شیرین ...؛ ٢ ـ ڕەنگ : سۆر ، سپی ...؛ ٣ ـ کیمباسی : کن ، کورت ...؛ ٤ ـ زێدای : درێژ ، ستور ...». هەرچی بۆ « پەسنێ چێکروخی » یشە ئەم نموونانەی : « گەڕناسی ، سواری، جوانی » هێناوەتەوە . ئەمە سەرپاکی ئەو باسەیە ، کە مامۆستا جگەر خوێن لە بەشی ئاوەڵناودا لێی‌دواوە ... وێڕای ئەو پێناسە ناتەواوەو ئەو دابەش کردنە نامەنتیقی‌یەو ئەو هەموو هەڵە زۆرە ، هەڵەیێکی یەکجار گەورە لەوەدا دەبینرێ ، کە سێ وشەی « گەڕناسی ، سواری ، جوانی » بە ئاوەڵناو داناوە . ئەو وشانە ، کە ئەسڵەکەیان « گەڕناس ، سوار ، جوان »ە پاشگری ( ـ ی )ی ناوی مەعنایان چووەتە سەر . ئەم پاشگرە لەگەڵ پاشگری ( ـ ی)ی سیفەی نیسبی جوداوازن ـ واتە دوو پاشگری سەربەخۆن و هەر یەکەیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتووەو ئەرك‌و دەوری جوداواز دەبینن . وێچوونی شێوەیان بووەتە هۆی ئەوەی مامۆستاجگەر خوێن بە یەك پاشگریان تێ‌بکا(١٢) .

---

( ١١ ) جگر خوین ، اوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .

( ١٢ ) بۆ زانیاری پتر لەبارەی ( ی )ی ناوی مەعناو ( ی ) ی سیفەی =



منتدى إقرأ الثقافي

سەرنجڕاکێش ئەوەیە ، پاش ( ٣٥ ) لاپەرەیێکو دوای چەندین باسی جۆربەجۆر ئنجا نووسەر لە لاپەڕە ( ٦٥ ــ ٦٦ )دا لە پلەی بەراورد دواوەو ئەم باسەشی چ لە ڕووی ناوەرۆکو چ لە ڕووی زاراوەوە پڕ هەڵەو کەموکورتییە ... لە ڕووی ناوەرۆکەوە ، ئەوەیە کە بە شێوەیێکی شێواندراو باسی نیشانەی ( ــ تر )ی کردووەو هیچ حاڵەتێکی دی ناو نەبردووە(٣١) . ئەوەی پێوەندیشی بە زاراوەکانی ئەم باسەوە هەیە نادروستە. بەوێنە بە پلەی بەراوردی وتووە «بیتر ناف» . بەم پێیە ئەو زاراوەیە ناتوانێ وشەکانی « کەمتر ، نزمتر ، خراپتر ... » بگرێتە خۆ ... سەرەڕای هەموو ئەوەش نووسەر بە هیچ چەشنێك ناوی پلەی باڵای نەهێناوە . ئەمەو چەندین باسی دی ، کە پێوەندییان بە ئاوەڵناوەوە هەیە لە کتێبی ناوبراودا بەرچاو ناکەون .

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لەو کتێبەیدا، کە بەناوی «سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی »یەوە بڵاوی کردووەتەوە لە هەندێ کێشەی ئاوەڵناو دواوە(١٤). ئەمیش وەك نووسەرانی دیکە باسەکەی بە پێناسەی ئاوەڵناو دامەزراندووەو دەڵێ : « ئاوەڵناو شتێکە ، کە تاریفی ناو یا ڕاناو دەکات، وە بۆی هەیە کە : ١ ــ یەك وشە بێت ، وەك : نەرمین زیرەکە ... ٢ ــ کە بتر بێ لە وشەیێك ، ئەو کچە ، قژزەردە جوانە دۆستمە ... ٣ ــ کە

---

=

نیسبییەوە ، بڕوانە :

أ ــ مەسعوود محەمەد ، بەکارهێنانی ( ی ) لە ڕێزمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژا ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٩ ــ ١٠٢ .

ب ــ فارووق عومەر صدیق ، وشەسازی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥، ل ٤١٧ ــ ٥٢٣ .

ح ــ د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ . ل ٥٢ ، ٥٩ ، ٦٦ ــ ٦٧ .

د ــ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١١٢ ــ ١١٥ ، ١٢٦ .

( ٣١ ) لەبارەی نیشانەی ( تر ) و حاڵەتەکانی تری پلەی بەراوردەوە ، بڕوانە لاپەڕە ( ٩٨ ــ ١٠٧ )ی ئەم کتێبە .

( ١٤ ) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٣ ــ ١٦٥ .



منتدى إقرأ الثقافي

ڕستەیێك بێ . وەك : ئەو کچە ، دوێنێ هات بۆ لای مامی ، قوتابی‌یە » ( ل ١٦٣ ـ ١٦٤ ) . بە ڕای من ئەم پێناسەیە ، نەك هەر زۆر نادروستە ، بەڵکو نارێكو لەنگیشە . بەر لە هەر شت ڕاست نی‌یە بووترێ ئاوەڵناو « شتێکە »، بەڵکو ڕاستتر وایە بووترێ « وشەیەکە » ... ئنجا ئاوەڵناو نەك ئەرکی تەنیا تاریفی ناو یان ڕاناو نی‌یە ، بەڵکو بەشە ئاخاوتنێکە واتای چۆنێتی‌و خاسیەت‌و دەلالەتیش ڕادەگەیەنێ ... جۆرە دەربڕینێکی وەهاش ، کە گوایا ئاوەڵناو بۆی هەیە «بتر بێت لە وشەیێك » یان « ڕستەیێك بێ » زۆر نابەجێ‌یە ، چونکە وشەکانی « زەرد »و « قژزەرد »و « جوان » تاکە تاکە ئاوەڵناون‌و کاتێ پێکەوە دێن ، ئەویش بە یاریدەی جێناوی (ە)ی کەسی سێیەم ، دەبنە دەستەواژەیێك کە واتای وەسفی تێدابێ ... خۆ هەرچی ڕستەی « دوێنێ هات بۆ لای مامی »یشە ڕاستە بەپێی ڕێزمانی ئینگلیزی دەوری ئاوەڵناو دەبینێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە نموونانە لە دەوری ڕستەسازی‌دان، نەك لە مەودای ڕۆنانی ئاوەڵناودا ، کە سەر بە باسی وشەسازی‌یە ... لێرەدا هەرچی وشەی «قوتابی »یە کە لە دوای ئەو ڕستەیەوە هاتووەو کە بە ڕەسەن ناوە ، دەوری ئاوەڵناو دەبینێ .

هەرچی پەراوێزی (١٢٤)یشە ، کە لەسەر پێناسەی ئاوەڵناو دایناوەو تێیدا دەڵێ : « ئاوەڵناو ، ئەگەر لەپاش ناوەوە یا ڕاناوەوە هات ئەو کاتە بێ زیاد و کەم لە قەوارەدا لەگەڵیاندایە ( تاك یا کۆ ) واتا ئەگەر ( ناوەکە ) یا ( ڕاناوەکە ) تاك بێ ، ئەوا ئاوەڵناوەکەش تاکە ، ئەگەر کۆ بێ ، ئەمیش کۆیە ، وەك :

ئەو ئازایە ( تاك ) . ئەوان ئازان ( کۆ ) . وەختی واش هەیە کە ( ئاوەڵناو ) لەپێیش ( ناوەوە ) یا ( ڕاناوەوە ) دێت ، وەك :

١ ـ ژمارەی پێش ناو : شەش تەن گەچم کڕی .

٢ ـ ئاوەڵناوی پێش ڕاناو : ئەو پۆلیسە پیس نەفەرە » ( ل ١٦٣ ).پڕ

هەڵەو ناتەواوی‌یەو سەرنج بۆ بەشێکیان ڕادەکێشین :

١ ـ ڕاست نی‌یە بوترێ ، ئەگەر ناو یان جێناو تاك بێ ، ئەوە دەبێ ئاوەڵناوکەش تاك بێ ، یاخود ئەگەر کۆ بن ، ئەمیش کۆ بێ ... وەك ئاشکرایە ، لە زمانی کوردیدا گەلێ حاڵەتی ئەوتۆ هەیە کە ئەم بۆچوونەی مامۆستا هەورامانی ڕەتبکەنەوە . بەر لە هەر شت پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە مامۆستا سەعید صدقی کابان لە لاپەڕە (٢٦)ی کتێبی « مختصر صرف‌و نحوی کوردی »دا نموونەی « منداڵانی زیرەك »ی هێناوەتەوەو دەڵێ : « نابێژرێ ( منداڵانی زیرەکان ) »(١٥) ... ئەوەتە

---

( ١٥ ) سەرچاوەی ناوبراو ، سەعید صدقی کابان ل ٢٦ :



منتدى إقرأ الثقافي

وشەی « منداڵان » ناوەو کۆیە ، بەڵام ، « زیرەك » ، کە ئاوەڵناوە تاکە ... جا نەك هەر دەشێ ناو کۆ بێو ئاوەڵناوەکەش تاك ، بەڵکو لە کوردیـــــدا پێچەوانەی ئەمەش هەیە ، واتە وا ڕێدەکەوێ ناوەکە تاکەو ئاوەڵناوەکە کۆ. ئەوەتە پیرەمێرد دەڵێ :

**ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بە شەو**
**وەك من بە داخەوەن ، نە سرەوتیان هەیەو نە خەو**

( پیرەمێرد ، ل ١٠٦ )

هەروەها گۆرانیش وتوویە :

**ئەی چاو ! چەشنی بازی قەفەســـی هەڵوەری پەڕت ،**
**کوا باڵــە تیژەکانـــی نیگـای حوســنی دلبـــەرت ؟**

( گۆران ، ب ، ل ٢١ )

٢ ــ لە ڕستەی «شەش تەن گەچم کڕی»دا وشەی «شەش» ژمارەیە ، نەك ئاوەڵناو . جا لێرەدا ژمارە پێش ناو کەوتووە ، نەك ئاوەڵناو پێش نـــاو کەوتبێ .

٣ ــ ڕستەی « ئەو پۆلیسە پیس نەفەرە » ، کە کردوویەتی‌یە نموونەی هاتنی ئاوەڵناو لە پێش جێناوەوە ، دروست نی‌یە . وەك ئاشـــکرایەو وەك نووسەر خۆی دیاریکردووە لەو ڕستەیەدا ئاوەڵناوەکە وشەی « پیس »ە ، کە لە پێش وشەی « نەفەر »دوە هاتووە ، بەڵام بە هیچ لێکدانەوەیێك وشەی « نەفەر » نابێتە جێناو . سەربارى هەموو ئەوەش لە ڕستەی ناوبـــراودا « پیس »و «نەفەر» دوو وشەی سەربەخۆو جیا نین ، بەڵکو بە هەردووکیان وشەی لێکدراوی « پیس‌نەفەر » یان پێکهێناوە .

... هند .

نووسەر پاشان دێتە سەر جۆرەکانی ئاوەڵنـــاو لە ڕووی ڕۆنانەوەو دەڵێ : « لە ڕووی قەوارەوە . ئاوەڵناو دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

**١ ــ ئاوەڵناوی ساکار :**

ئاوەڵناوی ساکار بریتی‌یە لە یەك وشە ، وەك : ئازا ، سوور ، زیرەك ، دوو ، هەندێ .

**ئازاد ئازایە .**
**دوو گوڵم لێ کردەوە .**
**هەندێ دەفتەرم کڕی ... هەندێ شتم کڕی .**



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ ئاوەڵناوی لێکدراو :

ئەم جۆرە پێکهاتووە لە بتر وشەیێک ، وەك : ڕێكوپێك ، دەستکرد ، بیستویەك ...

ئازاد ڕێکوپێکە
ئەو کورسی‌یە دەستکردە
بیستویەك صندوق گوێزم کڕی
ئەو زۆر نەرموشلە » ( ل ١٦٤-١٦٥ ) .

بەداخەوە ئەم بەشەش هەڵەو ناتەواوی هێندە زۆر تێدایە ، کە لــە توانستدا نی‌یە لە هەمووی بدوێین ، بۆیە تەنیا بەشێکی کەمیان دەخەینــە پێش‌چاو :

١ ـ لە باسی ئاوەڵناوی ساکاردا :

أ ) لە پێناسەکەدا دەبوو بوترێ « بریتی‌یە لە یەك مۆرفێم » ، نـــەك ماموستا هەورامانی واتەنی « بریتی‌یە لە یەك وشە » ، چونکە وەك ئاشکرایە، مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانەو هەرچی وشەشە دەشێ پێکهاتبێ لە چەند مۆرفێمێك .

ب ) وشەی « دوو » ، کە نووسەر بە ئاوەڵناوی داناوە ، ئاوەڵنـــاو نی‌یەو ژمارەیە .

ج ) وشەی « هەندێ » ، ئەگەرچی دەتوانێ وەك ئاوەڵناویش خـــۆی بنوێنێ ، بەڵام لە ڕەسەندا جێناوەو ماموستا نەدەبوو بە ئاوەڵناوی دابنێ .

د ) گەلێ ئاوەڵناوی سادەی چالاك لە زمانی کوردیدا هەنو نووســـەر ناوی نەبردوون .

٢ ـ لەباسی ئاوەڵناوی لێکدراودا :

نووســـەر لێـرەدا نـەك هــەر باســی ئەو هــەموو حالــەتـە زۆرو هەمەچەشنانەی نەکردووە ، کە لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوی لێکدراویـــان لێ پەیدا دەبێ (١٦) ، بەڵکو بە سێ نموونە ، کە یەکێکیان ژمارەیە ئەو باسە گرنگەی پێ تەواوکردووە .

سەرنـج ڕاکێشتر ئەوەشە کــە نووســـەر بە هیچ چەشنێك نە ناوی ئاوەڵناوی دارێژراوی هێناوەو نە باسی کردووە . وەك ئاشکرایە لە زمانـی

---

( ١٦ ) بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبـارەی ئاوەڵناوی لێکـدراوەوە ، بڕوانـە لاپەڕە ( ٨٦ ـ ٩٠ )ی ئەم بەرهەمە .



منتدى إقرأ الثقافي

کوردیدا ژمارەیێکی زۆر پێشگرو پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر ناوی سادەو ئاوەڵناوی سادەو ڕەگی کردار یان ناوی چـاوگو ئاوەڵکرداری سـادەو دەیانکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو(١٧) . جا دەبوو ئەم کێشە پێویستە بـاس بکرێ ... وێڕای ئەوە ، لە باسی ئاوەڵناوی کتێبی « سەرەتاییێك لـە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی »دا گەلێ کێشەی دی گرنگو پێویستی سەر بەو باسە هەیە ، کە نووسەرەکەی هەر ناویشی نەبردووە .

لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە لاپەڕە (٧٥-٩١)ی کتێبی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمـانو زانستەکانی »دا لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوی کۆڵیوەتەوە(١٨) .

بۆ لێکدانەوەی زاراوەی ئاوەڵناوو پێناسەی ئاوەڵناو ، باسی ئاوەڵناو بە گەشتێك بە هەندێ لەو نووسینانەدا دەستپێکراوە ، کە لەبـارەی ئاوەڵناوەوە نووسراون ... ئەوەی لێرەدا جێی سەرنج بێ ، ئەوەیە کـە لیژنەی ناوبراو لە سەرەتادا بۆ پێناسەی ئاوەڵناو ڕاییێکی یەکگرتوو لە نێوان ئەندامەکانیدا نەبووەو بۆیە هەر یەکە بەپێی تێکەیشتنو بۆچوونی خـۆی پێناسەیێکی تایبەتی خۆی پێشنیار کردووە ، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

« ١ ـ مامۆستا صادق بەهائەدین دەڵێت : ئاوەڵناو وشەیێکە وەصفی مەوصوفەکەی خۆی دەکاتو مەوصوفەکەی ناو بێت یا ڕاناو یا هـەر شتێکیتر بێت .

٢ ـ د. نەسرین فەخری دەڵێت : ئاوەڵناو ئەو وشـەیەیە کـە لـە خۆیدا ( وصفیة ) هەیە بۆیە جۆر و چۆنیەتی ( موصوف ) دیار دەخات لـە ڕستەداو بەمەدا لە ناو جودا دەکرێتەوە ، هەروەها توانای ئەوەی هەیـە جێگای ناو بگرێتەوە ئەگەر هاتو بوو بە صفەتێکی دیار یان هەمیشەیی لـە مەوصوفدا ، یان وەك ناو بەکار دێت بەمە هێزی وەصفیەتەکە دەردەکەوێتو بەمانەش لە ناو جودا دەکرێتەوە .

٣ ـ مامۆستا هەژار دەڵێت : ئاوەڵناو وشەیێکە لە خۆیدا مانـای ( وصفیة ) هەیەو لە ڕستەدا چۆنیەتی موصوف دەردەخات .

٤ ـ مامۆستا نووری عەلی ئەمین دەڵێت : ئاوەڵناو وشەیێکە گوزارەی

---

( ١٧ ) بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو باسە ، بڕوانە لاپەڕە ( ٧٦ ـ ٨٦ ) ی ئـەی نووسینە .

( ١٨ ) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمـانو زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧٥ ـ ٩١ .



منتدى إقرأ الثقافي

(وصفیة)ی تێدایەو بۆ تەواوکردنی واتای ناو یا ڕاناو ئاوەڵناوێکی تر بەکار دەهێنرێت ، هەندێ جاریش لە سنووری خۆی تێدەپەڕێتو لە ڕستەدا وەك ناو یا ئاوەڵکار یا تەواوکەری فیعلی مساعد بەکاردەهێنرێت وەك :

**نازدار هات ( نازدار بووە بە ناو )**

**بارام باش دەڕوات ( باش بووە بە ئاوەڵکار بۆ وشەی دەڕوات )**
**پەروین جوانە**

٥ ـ بیروڕای مەسعوود محەمەد : وا دیارە هەموو ئەندامان لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون کە ئاوەڵناو وشەیێکە ( **وصفیة**ی ) تێدایە . من ئەوەش دەخەمە سەر ( وصفیة )و دەڵێم وشەکە دەبێ بە کاتیشەوە نەبەسترابێتەوە . بەمەدا دەتوانین بڵێین ( ئاوەڵناو ناوێکە وەصفی تێدا بێ ) چونکە ناو بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە . ئەم تەعریفە بەشی ( ناو ) ناگرێتەوە ، چونکە واتای ( وصفیة ) لە ناودا نییە ، بەو پێیە تەعریفەکە بۆ تەنها بەشی ( ئاوەڵناو ) دەمێنێتەوە کە ئەمەش مەبەستێکی بنجییە لە دانانی تەعریفەکە» (ل ٧٧ـ٧٨).

دوای دەربڕینی ڕای جودا جودای ئەندامانی لیژنە ، لەسەر بناغەی ئەو بیروڕایەی مامۆستا مەسعوود محەمەدو هەندێ ڕوونکردنەوەی دی بڕیار درا ئەم پێناسەیەی خوارەوە بۆ ئاوەڵناو پەسەند بکرێت .

« ئاوەڵناو وشەیێکە ( وصفیة )ی تێدایەو بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە » (ل ٨١) .

بە پێویستی نازانم لەو بیروڕا جوداوازانە بدوێم ، کە لە سەرەتادا ئەندامانی لیژنە بۆ پێناسەی ئاوەڵناو دەریانبڕیوە ، بەڵکو باشتر وایە ڕا یەکگرتووە پەسەندکراوەکەو هەندێ لێکدانەوەی دەمڕاستی لیژنە بخەمە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە :

ئەگەرچی ڕاستە کە ئاوەڵناو ( وصفیة )ی تێدایە ، بەڵام ئەمە باش ئەوە ڕوونناکاتەوە خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاریدەکا یان لەسەر بناغەی واتای لێکسیکی ( سوور ، لاواز ، چاپووك ... ) یان لە ڕێگای پێوەندیی شت بە شتی تردەوە ( کێوی بەفرین ، زمانی کوردی ... ) ڕادەگەیەنرێ ... یاخود دەبوو ئەنجە بۆ ئەوە درێژیبکرێ ، کە ئاوەڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك واتای چۆنیەتی و خاسیەتو دەلالەت نیشاندەدات . ئەم نیشاندانەش چ لە بەکارهێنانی ڕستەسازیداو چ لە تایبەتێتی وشەسازیدا ڕوونو ئاشکرا بەدیاردەکەوێ .

ئەگەر لە لاپەڕە (٨١)ی ئەو کتێبەوە ، کە پێناسەی « ئاوەڵناو »ی



منتدى إقرأ الثقافي

تێداکراوه ، بگەڕێینەوه بۆ لاپەڕە (١٠) ، که پێناسەی « ناو »ی تێدایه ، ئەوه دێته پێش چاومان ، که بۆ ئەو بەشه ئاخاوتنەش دیسان چەمکی به کاتەوه نەبەسترانەوه ڕەچاوکراوەو وتراوه : « ناو ئەو وشەیەیه سەربەخۆ واتایێك دەگەیەنێت که به کاتەوه نەبەستراوه ... » ( ل ١٠ ) . لێرەدا به پێویستی نازانم له نادروستی گرتنی لایەنی به کاتەوه نەبەسترانەوه بۆ ئاوەڵناو بدوێم، چونکه کاتی خۆی له پێناسەی (ناو)دا به دوور و درێژی لێیم کۆڵیوەتەوە(١٩). لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم ، ئەگەر لەو ڕێگایەوه بۆ پێناسەی ( ئاوەڵناو ) بچین ، ئەوه دەبێ بۆ ( جێناو ) و ( ژمارە ) و ( چاوگ ) و ( پێشبەند )و ( ئامرازی پێوەندی ) و ... هتدیش ، هەمان مەسەلەی نەبەسترانەوه به کاتەوه لەنەزەر بگرین ، چونکه ئەو بەشه ئاخاوتنانەش که ناومان بردن ، تێکرایان به کاتەوه نەبەستراونەتەوه .

دەمڕاستی لیژنه لەو لێدوانەیدا که دەڵێ : « لێرەدا دەمەتەقه هەڵدەستێ لەسەر ئەمه ئایا که وشەیێکی ئاوەڵناوی بێگومانی وەك ( جوان ، تێر ، ئازا ... ) له فەرهەنگدا ئیشارەی بۆ کرا که ( ئاوەڵناو )ه ، کەچی له ڕستەدا جێگەی وەصفکردنی کار فعل )ی گرتەوه وەك که بگوترێ ( تێرم خوارد ... ) » ( ل ٧٨ ) ... « لەبارەی بەکارهێنانی وشەی ئاوەڵناوی بێگومانی وەك ( جوان ) بۆ وەصفی کار ( فعل ) دەتوانین بڵێین لەو تەرزه جێگەیەدا ( موصوف ) یێکی قرتاو هەیه ، که وەصفەکه دەلالەتی لێدەکا . به نموونه که گوتمان ( زۆرم خوارد ) لێرەدا به ئەصڵ (خواردنێکی زۆرم خوارد) بووەو وشەی (خواردن) قرتاوه که (زۆر) دەلالەتی لێدەکاو فیعلی(خوارد)یش ئیشارەی بۆ دەکا ... » ل ٧٩ ) ... « له کوردیشدا وشەیێکی ( ئاوەڵکار ) که له مادەی وشەیێکی ( ئاوەڵناو )ەوه وەرگیرێت داڕشتنێکی تایبەتی بۆ بەکاردێت . به نموونه له وشەی ( جوان ) که ئاوەڵناوه (بەجوانی) دەگوترێ بۆ ئاوەڵکار ، هەروەها ( ئازایانه ، مەردانه ) ئاوەڵکارن له ( ئازا ، مەرد ) وەرگیراون ... » ( ل ٧٩ ) ... « به نیسبەت ئەوەوه که بگوترێ ئاوەڵناو لەوانەیه ببێته ناو وەك ( زانا هات ) ، لێرەدا هیچ سروشتەو تایبەتییێکی ئاوەڵناو دەخلی بەسەر ڕستەکەوه نیيه ، چونکه ( زانا ) بۆته ( ناوی تایبەتی ــ اسم علم ) ... » ( ل ٨٠ ) ... هەندێ شتی تێکەڵ به یەك کردووه ...

له ئەنجامی پێشکەوتن و گەشەکردنی زماندا ، وشه له بەشێکی ئاوخاوتنەوه دەگوێزرێتەوه بۆ بەشێکی دی ئاخاوتن . له ئەنجامی ئەو

---

( ١٩ ) بڕوانه : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٤٢ ــ ٤٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

ڕاگوێزانەشدا . وشە خاسیەتی پێشووی نامێنێ‌و شێوەی نوێ وەردەگرێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی ڕستەسازی دەگۆڕێت . بە وێنە وشەی « جـوان » لە ڕستەی « کچی جوان زۆرە » ؛ « جوان کچێکی باشە »دا دوو بەشـــی جیاوازی ئاخاوتن‌و دوو ئەندامی جیاوازی ڕستەن . لە ڕستەی یەکـەمـدا « جوان » ئاوەڵناودو دیارخەرە . بەڵام هەر ئەو وشەیە لە ڕستەی دووەمـدا واتایێکی تری وەرگرتووەو مەبەستێکی دی داوە ــ واتە بووە بە ناوو ئەرکـی دیارخراو بەجێ دێنێ . وشەی « جوان » لە سەرەتادا هەر ئاوەڵناو بـووە ، بەڵام دواتر ــ واتە لە ئەنجامی گەشەکردن‌و پێشکەوتنی زماندا ــ وەك ناوی تایبەتی کەوتۆتە کار . وشەی « پیاوانە » لە ڕستەی « مام بارام جلی پیاوانە دەفرۆشێ »دا ئاوەڵناوە ، چونکە وەسفی ناو دەکا . بەڵام ئەگەر بوتـــرێ « ئازاد پیاوانە دانیشتووە » ، ئەوە وشەی « پیاوانە » دەبێتە ئاوەڵکـردار ، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا ــ واتە چۆنیەتی دانیشتن نیشان‌دەدات . هەروەها لە ڕووی ڕستەسازی‌یەوە ئەرکی جیاواز دەبینن . وشەی «هێمن» لە ڕستەی « ئازاد کوڕێکی هێمنە »دا ئاوەڵناوە ؛ لە ڕستەی « هێمن کوڕێکی زیرەکە »دا ناوە ؛ لە ڕستەی « دارا هێمن دەڕۆیشت »دا ئاوەڵکردارە . بەم جۆرە دەبینین کە وشەی « هێمن » وەك ئاوەڵناوو ناوو ئاوەڵکردار خــۆی دەنوێنێ ــ واتە وەك سێ بەشی ئاخاوتن بەکاردەهێنرێ ... هەندێ وشــە هــەن ، وەك ( دەر ، بــەر ، لا ، پێش ، پــاش ، دوا ، ژێــر ، بــن ... ) کە ناوو ئاوەڵکردارن ــ واتە وشەی واتادارن ، بەڵام دەتوانن وەك پێشگریش خۆیان بنوێنن . بەوێنە ( بەر ) لە وشەی لێکدراوی « بەرماڵ »دا یاخود لــە ڕستەی« نەسرین‌چووە بەر هەتاوەکە»دا وشەیە ، بەڵام لە وشەی «بەربوون» ... دا پێشگرە . هەروەها ژمارەیێك پێشبەند ، بەوێنە ( پێ ، تێ ، لێ ...) وەك پێشگریش خۆیان دەنوێنن ، بە نموونە « پێکەنین ، پێگەیشتن ... ) ؛ « تێکردن ، تێگرتن ... » ؛ « لێدان ، لێنان ... » ... هتد .

ڕاستە ئەگەر وشەیێك لە بنەڕەتدا ناو بێ نالوێ لە هەمان کاتدا لـــە ڕیزی ئاوەڵناو یان ژمارە دابنرێ ... بێ‌گومان لێرەدا مەبەست گوێزانەوەی وشە نی‌یە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشـــێکی دی . بەڵێ ناو دەشێ وەك ئاوەڵناو بەکاربهێنرێ ، بەڵام ئــەو وشـــەیە ناشێ لە یەك کاتدا ناویـــش‌و ئاوەڵناویش بێ .

گوێزانەوەو گۆڕانی وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێکی دیکـــەی ئاخاوتن ، دیاردەیێکی هەمیشەیی‌یە لە زماندا  لەبەر ئەوە دابەش‌کردنی وشە بەسەر بەشەکانی ئاخاوتندا کارێکی گرانە . بێ‌گومان هەر زمانێکیش لـــە گواستنەوەو گۆڕانی وشەکانیدا ، خاوەنی توانست‌و تایبەتێتی خۆیەتی . لە زمانی کوردیدا ، وەنەبێ هەموو بەشـەکـانی ئاخاوتـن وەك یەك بەئاسانـــی



منتدى إقرأ الثقافي

بگۆڕێن . بەوێنە ئاوەڵناو زوو دەبێتە ناوو ئاوەڵکردار ؛ پێشبەندو ئاوەڵکردار چالاکتر لە بەشەکانی تری ئاخاوتن دەبنە پێشگر ، بەڵام جێناو لەو ڕووەوە کەم توانستە(٢٠) .

مامۆستا مەسعوود لەوەدا ڕاستە ، کە دەڵێ : « بەنموونە کە گوتمان ( زۆرم خوارد ) لێرەدا بە ئەصل ( خواردنێکی زۆرم خوارد ) بووەو وشەی ( خواردن ) قرتاوە کە ( زۆر ) دەلالەتی لێدەکا ... » ( ل ٧٩ ) ، بەڵام کاتێ دەوترێ « خواردنی خۆشم زۆر خوارد » خۆ ئەوە هیچ وشەیێك نەقرتاوەو ( زۆر ) یش ڕوونو ئاشکرا وەسفی کردارەکە دەکاو گومان لە ئاوەڵکرداری ناکرێت ...

لیژنە دوای ئەو لێدوانو پێناسەیە لە ڕووی پێکهاتنەوە لە ئاوەڵناو دواوە . ئەگەرچی لەم بارەیەوە هەندێ جیاوازیی بیروباوەڕ لە نێو ئەندامانی لیژنەدا هەیە ، بەڵام لە ئەنجامدا لە ڕووی پێکهاتنەوە هەروەك ناو ، ئاوەڵناویشی بەسەر سادەو ناسادەدا دابەشکردووە . هەرچی ناسادەشە داڕێژراوو لێکدراوی لێجیاکردۆتەوە .

بەداخەوە ، ئەم باسە شتی لاوەکی زۆر تێئاخنراوە ،کەچی هەندێ شتی سەرەکیو پێویست باسنەکراوە . بەوێنە ئەم باسە چوار لاپەڕە دەبێتو ماکەکەی لە دوو دێڕ تێناپەڕێ ... کەمو کورتیو ناتەواوی هەرە بەرچاوی ئەم باسەش لەوەدایە کە لیژنە لە چۆنیەتیو جۆری ڕۆنانی ئاوەڵناوی ناسادە نەدواوە ــ واتە باسی ئەو پێشگرو پاشگرانەی نەکردووە کە یاریدەی دروستکردنی ئاوەڵناو دەدەن ؛ یاخود باسی شێوازی پێکهاتنو جۆرەکانی ئاوەڵناوی لێکدراوی نەکردووە ... بە نموونە لە زمانی کوردیدا ژمارەیێکی زۆر پاشگرو چەند پێشگرێك هەن ، دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادەو دەیانکەنە ناوی داڕێژراو(٢١) ... لیژنە نەك هەر باسی ئەو پاشگرو پێشگرانەی نەکردووەو دەربارەی ئاوەڵناوی داڕێژراو هیچ شتێکی نەوتووە ، بەڵکو سەبارەت بە ئاوەڵناوی لێکدراویش هیچی نەنووسیوە .

---

( ٢٠ ) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە :
أ ) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٣ ــ ١٥ .
ب ) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ٣ .
( ٢١ ) بڕوانە لاپەڕە ( ٧٦ ــ ٨٦ )ی ئەم کتێبە .



منتدى إقرأ الثقافي

پاش ئەوەی لیژنە بەو ناتەواوی‌و کەم‌وکورتی‌یە لە ئاوەڵناوی سادەو ناسادە دواوە ، ئنجا هاتۆتە سەر باسی « ئاوەڵناو لە ڕووی گوزارەوە » ( ل ٨٥ ــ ٩١ ) . لە سەرەتادا ئەودی مامۆستایان : سەعید صدقی کابان‌و تۆفیق وەهبی لەو بارەیەوە وتوویانەو ئەودی لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکاندا نووسراوە خستوویانەتە بەرچاوو ئنجا ئەندامانی لیژنە یەکە یەکە ڕای خۆی لەباردی « جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە » دەربڕیوە ... بەداخەوە ، ئەم باسەش کەم‌و کورتی‌و هەڵەی زۆرە :

بەر لە هەر شت ، لیژنە دەبوو وێڕای ئەو سێ سەرچاوەیە(٢٢)، ئەو

---

( ٢٢ ) سەیرو سەمەرە ئەوەشە ، بەشێکی زۆری زانیاریی نێو ئەو سەرچاوانەیان بە هەڵە بۆ کارەکەی خۆیان گوێزاوەتەوە بەندوونە ، دەڵێن : « لە ڕێزمانی قوتابخانەکاندا ، ئاوەڵناو کراوە بەم بەشانەی خوارەوە :

١ ــ ئاوەڵناوی فرمانی : ئەمیش دەکرێ بە سێ بەشەوە :

١ ــ بکەر ، وەك : نووسەر ، بکوژ .

٢ ــ کراو ، وەك : نووسراو ، هەڵکەندراو .

٣ ــ ناوی فرمان ، وەك : گریە ، پرسە ، ترس .

٢ ــ ئاوەڵناوی ئیشاری :

أ ــ ئیشاریی دیار ، وەك :

ئەم ــ ئەو

ئەمە ــ ئەمانە

ئەوە ــ ئەوانە

ب ــ ئیشاریی نادیار وەك :

گەلێك ، هیچ ، فلان ، هین .

٣ ــ ئاوەڵناوی چەندی ، ئەمیش دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

١ ــ ئاوەڵناوی چەندیی نادیار .

( هیچ میسالی بۆ نەهێناوەتەوە )

٤ ــ پلەکانی ئاوەڵناو : ددی‌کات بە سێ بەشەوە :

١ ــ پلەی چەسپیو : گەورە ، ڕووت .

٢ ــ پلەی بەراوردی : گەورەتر ، ڕووتتر .

٣ ــ پلەی بالا : جوانترین ، گەورەترین » ( ل ٨٦ ) .

بەڵام ئەودی لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکاندا سەبارەت بەو کێشەیە نووسراوە ، بەم جۆرەیە :

* لە کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا :

=



منتدى إقرأ الثقافي

سەرچاوانەی تریش ، کە باسی ئاوەڵناویان کردووە بخاتە پێش چاو ، چونکە وەك ئاشکرایە پێش ئەو ئەوانەی لیژنە گەلێ باس و نووسینی تر دەربارەی ئاوەڵناو بڵاوکراونەتەوە (٢٣) .

ڕەنگە زێدە ڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێم هەموو ئەندامانی لیژنە ( جگە لە مامۆستا مەسعوود محەمەد ) لە دابەش کردنی ئاوەڵناودا لە ڕووی واتاوە ، تووشی هەڵەی گەورە گەورە بوون . بەوێنە :

---

=

١ ــ ئاوەڵناوی چۆنی ( ل ٦٦ ــ ٦٧ )
٢ ــ پلەکانی ئاوەڵناوی چۆنی ( ل ٦٨ ــ ٧١ )
* لە کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا :
٣ ــ ئاوەڵناوی نیشانە ( ل ٨٥ ــ ٨٦ )
* لە کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەییدا :
٤ ــ ئاوەڵناوی ژمارەیی
أ ــ ئاوەڵناوی ژمارەیی بنجی ( ١٩ ــ ٢٢ )
ب ــ ئاوەڵناوی ژمارەیی تەرتیبی ( ل ٢٣ ــ ٢٦ )
ج ــ ئاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی ( ل ٢٧ ــ ٣١ )
٥ ــ ئاوەڵناوی نادیار ( ل ٣٢ ــ ٣٣ )
* لە کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەییدا :
٦ ــ ئاوەڵناوی بکەر ( ل ٢٧ ــ ٣٤ )
٧ ــ ئاوەڵناوی کراو ( ٣٥ ــ ٤٢ ) .

( ٢٣ ) بە نموونە :
أ ــ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١١ ــ ١٤١ .
ب ــ جگر خوین ، آوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٢٩ ــ ٣٠ ، ٦٥ ــ ٦٦ .
ج ــ محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٣ ــ ١٦٥ .
د ــ د. قەناتێ کوردۆ ، زمانێ کوردی ، چاپی چوارەم ، یەریڤان ، ١٩٧٠ ، ل ٥٠ ــ ٥٤ ، ٨٩ .
هـ ــ د. قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٢٦ ــ ١٣٨ .
و ــ
D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Stndies, London, 1961, PP 163-168
...و گەلێکی تر .



منتدى إقرأ الثقافي

١ ـ ح مامۆستا صادق بەهائەدین و چ د. نەسرین فەخری و چ مامۆستا نووری عەلی ئەمین پلەکانی ئاوەڵناویان بە جۆرێك لە جۆرەکانی ئاوەڵناو داناوە لە ڕووی واتاوە .. وەك ئاشکرایە ، پلەکانی ئاوەڵناو فۆرمی جیاوازی یەك وشە نیشاندەدەن و حاڵەتی ڕێزمانین ، لەبەر ئەوە هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشاندەدەن ، بۆیە ڕاست نی‌یە وەك وشەی جیاجیا تەماشابکرێن ، واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن ، بەڵکو فۆرمی جۆر بەجۆری یەك وشە دەردەبڕن . کەواتە مەسەلەکە وشەگۆڕی‌یە ، نەك وشەڕۆنان . جا بۆیە ناکرێ ئەم کێشەیە بخرێتە باسی جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە .

٢ ـ مامۆستا نووری عەلی ئەمین هەشت جۆر ئاوەڵناوی دیاری‌کردووە، کە زوربەیان نەك هەر بە ئەسڵ ئاوەڵناو نین ، بەڵکو لەو نموونانەشدا کە بۆیانی هێناوەتەوە نە بوون بە ئاوەڵناوو نە دەوری ئاوەڵناو دەبینن . لێرەدا بە پێویستی نازانم لەو بۆچوونانە بدوێم ، چونکە مامۆستا مەسعوود محمەد لە لاپەڕە ( ٨٩ ـ ٩١ )دا بە شێوەیێکی زانستی ڕەتی کردوونەتەوە ...

تێکرای باسی ئاوەڵناو لە کتێبی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی »دا یەکجار سادەو پڕ ناتەواوی و هەڵەیە ...

یەکێ لەو کارە دیارانەی لەبارەی « ئاوەڵناو »ەوە نووسراوە ، ئەو لاپەڕانەن . کە مامۆستا ئەحمەد حەسەن لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا(٢٤) هێناوی‌یەتە بەرهەم ( بڕوانە : ل ١٢٩ ـ ١٥٧ ) .

نووسەر تا ڕادەیێك بە شێوەیێکی باش پێناسەی ئاوەڵناوی کردووەو زانیاری ڕاستی لەبارەی شوێن و دەرکەوتنی ؛ چۆنیەتی بەستنی بە ناوەوە ؛ شێوەی وەرگرتنی نیشانەی ناسیاوی و کۆ ... وە تۆمار کردووەو دەڵێ : « ئاوەڵناو : وتەیەك یان پترە ، چەشن یا شکڵی ناوێك یا ڕاناوێك پیشان ئەدا . وە بە ئاسانی شوێنی ناوەکەی ئەکەوی ، وە پیتی بەستەر (ی) پێکیانەوە ئەبەستێ . وە ئەگەر ناوەکە بەرناس کراو بوو بە ( کە ، کان ) پێویستە ئەم ئامرازە لە ناوەکە بگوێزرێتەوە بۆ ئاوەڵناوەکە ، وە ئەوسا پیتی بەستەر (ە) لەجیاتی (ی) بەکاربەت ئەگەر ناوەکە بە پیتێکی بێ‌دەنگ یان ( وو ، ی ) دوایی هاتبوو ، بەڵام ئەگەر بە پیتی دەنگدار دوایی هاتبوو پیتی بەستەری نابێ . ئەگەر ئاوەڵناو خۆی بە تەنیا بوو ئەمرازی بەرناسی تاك یان کۆمەڵ پاشکوێ ئەبێ بە گوێرەی هەمان دەستوور کە ئەبێتە پاشکۆی ناو ... » ( ل ١٢٩ ) .

ئەگەرچی زانیاری و وتەکانی ئەو چەند دێڕەی مامۆستا ئەحمەد حەسەن هەندێ ناتەواوی‌یان تێدایە ، بەڵام تێکڕا مەبەست دەپێکن .

---

( ٢٤ ) ئەحمد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی بەغدا ، ١٩٧٦ .



منتدى إقرأ الثقافي

نووسەر کە هاتۆتە سەر باسی ئاوەڵنـاو لە ڕووی ڕۆنانەوە ، سـێ جۆری دیاری‌کردووە : « ١ ـ سادە ؛ ٢ ـ لێکدراو ؛ ٣ ـ کۆژ یان ڕستە » ( ل ١٢٩ ) ... لە سەرەتادا بە دوورو درێژی لە ئاوەڵناوی سادەو چۆنیەتیی خۆنداندنی دواوەو شایانی باسە ، ئاوەڵناوی ( کە ، تر ، دی )ی لەگەڵ ئەم بەشەدا داناوەو لێی کۆڵیوەتەوە ... هەڵەی گەورەی ئەم باسە ، ئەوەیە کـە مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئاوەڵناوی دارێژراوی بە یاریدەی پاشگری (ـن —in ) و ( ـ یـار)و ( ـ باز)و(ـ ۆك )و( ـەوەر )و ( ـەوار )...سازبوو ژمارەی خاوەن نیشانەی ( ـەم - ـەمین) واتە ـ ژمارەی تەرتیبی ـو ناوی کاراو ناوی بەرکاری وەك : هاتوو ، کەوتوو... کریار... یشی بە ئاوەڵناوی سادە داناوە ( بڕوانە : ل ١٣٦ ـ ١٣٨) .

لە بەشی ئاوەڵناوی لێکدراودا هەرچەندە هەندێ نموونەی جوانی بـۆ چەشنە جوداوازەکانی وشـەی لێکـدراو هێنـاوەتەوە ، بەڵام بەداخـەوە تێکەڵ کردنێکی تەواو بەرچاو دەکەوێ.نووسەر بەر لە هەموو شتێك ئاوڵناوی دارێژراوو لێکدراوی بە یەك شت داناوەو لە یەك جودای نەکردوونەتەوە . پێشتر ئەوەمان وت ، کە هەندێ ئاوەڵناوی دارێژراوی بە ئاوەڵناوی سادە لە قەڵەم داوەو سەیر ئەوەیە دواتریش بەشێکی تریانی بە ئاوەڵناوی لێکدراو داناوە . ئەمەش هەڵەیێکی بنەرەتیی باسەکەیەتی ، کە هەر لە سەرەتاوە بە ڕێگەیێکی چەوتدا ڕۆیشتووە . بێ‌گومان ئەمەش کەم‌و کورتییێکی گەورەیە... سەرەڕای ئەوە ، کە مامۆستا بەشێك لە ئاوەڵناوی دارێژراوو سادەی بـە ئاوەڵناوی سادە ژماردووەو بەشێکی دی ئاوەڵناوی دارێژراوو لێکدراوی بە یەك جۆر ئاوەڵناو داناوە ، ئنجا گەلێ پێشگرو پاشگرو چەشنی جۆراوجۆری ئاوەڵناوی لێکدراوی یادداشت نەکردووە .

جگە لەوە ، مامۆستا لە دیاری‌کردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخـاوتنندا هەڵەی کـردووە . بەوێنە وای نیشـانداوە ، کە وشـەی «زۆرخـۆر » و « ڕاستگۆ »و « چەپنووس » لە دوو ئاوەڵناو پێکهاتوون ( بڕوانە : ل ١٣٩ ). ڕاستە « زۆر » و « ڕاست »و « چەپ » ئاوەڵنـاون ، بـەڵام « خـۆر » و « گۆ »و « نووس » ئاوەڵناو نین‌و ڕەگی کردارن . بەم چەشنە «زۆرخور »و « ڕاستگۆ » و «چەپنووس » لە دوو ئاوەڵناو پێك‌نەهاتوون ، بەڵکو لـــە ئاوەڵناوو ڕەگی کردار دروست‌بوون .

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمد لە باسی جۆری سێیەمی ئاوەڵناودا کە بە ناوی « ئاوەڵناوی کۆژو ڕستە »وەیە ( ل ١٥١ ـ ١٥٢ ) ، کە مەبەستی ئەو دەستەواژەو ڕستانەن دەوری ئاوەڵناو دەبینن ، کەوتۆتە ژێر تەئسیری چاولێکەریی ڕێزمانی ئینگلیزی‌یەوە . زمانەوانانی ئینگلیز بەپێی هەڵکەوتـی



منتدى إقرأ الثقافي

زمانەکەیان هەندێ ڕستەو دەستەواژەیان دیاریکردووە ، کە دەوری ئاوەڵناو دەبینن ، بەڵێ لە زمانی کوردیشدا ئەو جۆرە حاڵەتانە دەبینرێن ، بەڵام بەگشتی ئەمە پتر پێوەندی بە ڕستەسازییەوە هەیەو ڕاست نییە بخرێتە نێو باسی ڕۆنانی ئاوەڵناوەوە ، کە باسێکی سەر بە وشەسازییە .

لە لاپەڕە ( ١٤٢ ــ ١٤٤ )دا لەژێر سەرباسی «ئاوەڵناوو وەپاڵخستن» داو لە لاپەڕە ( ١٤٤ ــ ١٤٧ )دا بە ناوی « ئەگەر ناوێك دوو یا پتر ئاوەڵناوی هەبوو »ەوە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی هەندێ نیشانەی ئیزافە لە نێوان دیارخراوو دیارخەردا دواوەو باسی ئەوەی کردووە ، کە ئەگەر چەند دیارخەرێك بەدوا یەکتریدا بێن چی بە یەکیانەوە دەبەستێ ...

کێشەی کردنی ئاوەڵناو بە ناو کە مامۆستا ئەحمەد حەسەن لە ژێر ناوی « چۆن ئاوەڵناو ئەکەین بە ناو » دا ( ل ١٤٨ ــ ١٥١ ) لێی دواوە زۆر کورتوکۆڵەو وای بۆچووە ، کە تەنیا پاشگری ( ــ ی ، ــ ایەتی ، ــ ێتی ) ئاوەڵناو دەکەنە ناو ... بەداخەوە وەك خۆی بە بیریدا نەهاتووە ، سەرچاوەی کوردیشی بۆ تەماشا نەکردووە . دەنا لە مێژە مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی » دا ژمارەیێك پاشگری دەستنیشانکردووە ، کە ئاوەڵناو دەکەنە ناو ، وەك : ( ــە ) : « خراپە ... » ؛ ( ــ ێنە ) : ؛ « زەردێنە ... » ؛ ( ــکە ) : « ڕەشکە ... » ... و گەلێکی تر (٢٥) ، کە لە ژێر سەرباسی « ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادەو دەیانکەنە ناوی داڕێژراو » دا لە بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەماندا لییان دواوین (٢٦) .

هەرچەندە لە باسی ئاوەڵناوی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەددا کەموکورتیو ناتەواویو هەڵە دەبینرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ سێودوو دەتوانم بڵێم یەکێکە لەو کارە باشانەی کە تا ئێستا بە زمانی کوردی لەبارەی ئاوەڵناوەوە نووسرابێ .

لە کتێبی «زمانی یەکگرتووی کوردی » ی د. جەمال نەبەزدا(٢٧) سێ کورتە باس بەرچاو دەکەون ، کە پێوەندییان بە ( ئاوەڵناو ) ەوە هەیە ، وەك : « پاشگری نێوی کارا ( ــ وو $\overline{in}$ )و ( ــ ی I ــ)ی کارێکی تێنەپەڕو

---

( ٢٥ ) نووری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

( ٢٦ ) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ل ١٢٦ ــ ١٢٨ .

( ٢٧ ) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .



منتدى إقرأ الثقافي

تێپەر » (ل ٣١) ؛ « پاشگری نێوی بەرکار (ـ راو RAW ـ)و (ـ رای RAY )ی کارێکی تێپەڕ » ( ل ٣١ ـ ٣٢ ) ؛ « ئاوەڵنێوی ( تر ) و ( دی ) » ل ٣٢ ـ ٣٣)

نووسەر باش لە ئاوەڵناوی (تر)و (دی) دواوەو بە شێوەیێکی ڕاستو زانستی باسەکەی دامەزراندووەو بە نموونەو بەڵگەوە لە نیشانەی (تر)ی پلەی بەراوردی جیاکردووەتەوە ... بەڵام ئەوەی پێوەندی بە باسی ڕۆنانی ناوی کاراو ناوی بەرکارەوە هەیە . ناتەواوی زۆری تێدایە ، بەتایبەتی لەوەدا کە تەنیا ناوی پاشگری (ـوو)و (ـی) ؛ (ـراو)و (ـرای)ی کردووەو ئەوانی دی باسنەکردووە .

مامۆستا صادق بەهائەدین لەو نووسراوەیدا کە بە ناوی « ڕێزمانا کرمانجی »یەوە نووسیوێتیو بە ڕۆنیـو ڕاکێشراوە(٢٨) لە لاپەڕە (١١٢ ـ ١٢٧)دا لەژێر سەرباسی « هەڤالناف »دا لە ئاوەڵناو دواوە .

هەرچەندە ئەو پێناسەیەی ئەم نووسەرە بۆ ئاوەڵناوی داناوە ، هەندێ کەمو کورتی تێدایە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کەڵکی لە پێناسەی ئاوەڵناوی کتێبی « زمانی کوردی» ی د. قەناتی کوردۆ وەرگرتووە(٢٩) ، بۆیە لە زۆر ڕووەوە لە بەشێك لەو پێناسانەی تاکو ئێستا ناومان بردوون باشترە .

بەدوا ئەوەدا ، مامۆستا صادق ئاوەڵناو بە سەر شەش بەشدا دابەش دەکا : « ١ ـ هەڤالناڤێ چەوانیێ ... ؛ ٢ ـ هەڤالناڤێ هژماریێ ... ؛ ٣ ـ هەڤالناڤێ نیشانکرنێ ... ؛ ٤ ـ هەڤالناڤێ ئارزێ ( هەییێ ) ... ؛ ٥ ـ هەڤالناڤێ پرسیارێ ... ؛ ٦ ـ هەڤالناڤێت نەبەن ... » ( ل ١١٢ ـ ١١٣ )(٣٠)و بەجیا بە دوورو درێژی لە هەریەکێکیان دواو ...

---

( ٢٨ ) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

( ٢٩ ) بڕوانە : د. قەناتێ کوردۆ ، زمانێ کوردی ، چاپی چوارەم ، یەریڤان، ١٩٧٠ ، ل ٥٠ .

( ٣٠ ) سەرنجڕاکێش ئەوەیە ، مامۆستا صادق بەهائەدین لە دەمەتەقێی لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورددا سێ جۆر ئاوەڵناوی جیاکردووەتەوە ، لەگەڵ ئەوەدا کە چ کتێبە تایبەتی‌یەکەی خۆیو چ کارەکەی لیژنە هەر لە یەك ساڵدا دەرچوون . ئەوەش ئەو وشانەیەتی کە لە کۆبوونەوەکانی لیژنەدا دەری بڕیون :

« مامۆستا صادق بەهائەدین دەڵێت ئاوەڵناو بکرێت بەم بەشانەوە :

١ ـ ئاوەڵناوی وەسفی ، وەك : سەوز ، گەورە ، پان .

٢ ـ ئاوەڵناوی نیسبی ، وەك : تەنەکەچی باخەوان .

٣ ـ لە ڕووی پلەشەوە سیانە ( گەورە ، گەورەتر ، گەورەترین)»

( بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨٧ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

ئەگەرچی نووسەر کەرەستەیێکی زۆری خستۆنە پێش چاو ، بەڵام لە باسە بنەڕەتییەکە دوور کەوتۆتەوەو گەلێك شتی هەمەجۆری تێکەڵ بەیەکتر کردووەو هەندێ بەشە ئاوخاوتنی وەك جێناوو ژمارە ... ی بە ئاوەڵناو داناوە .

نووسەری « ڕێزمانا کوردی » لە ڕووی فۆرمەوە ڕاست ئاوەڵناوی بەسەر ( سادە )و ( داڕێژراو )و ( لێکدراو )دا دابەش‌کردووە(٢١) ، بەڵام لە لێکدانەوەو باسکردنیاندا ناتەواوی‌و هەڵەی گەورە گەورە دەبینرێ :

١ ــ گەلێ وشەی واتادار بە پاشگر دانراوەو کەچی گەلێ پاشگری ئاشکراو دیار باس‌نەکراوە .

٢ ــ باسی ئاوەڵناوی داڕێژراو بە دوورو درێژی کراوە ، کەچی لەبارەی ئاوەڵناوی لێکدراوەوە تەنیا چەند دێڕێك نووسراوە .

٣ ــ گەلێ ناوی لیکدراوو داڕێژراو بە ئاوەڵناوی داڕێژراو لە قەڵەم دراوە .

... هتد .

لە لاپەڕە ( ٦٤ ــ ٦٥ ) ی کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا (٢٢) بە ناوی « ئاوەڵناو »ەوە هەندێ زانیاری بە شێوازی فێرکردن خراوەتە پێش چاو... لە لاپەڕە ( ٦٦ ــ ٦٧ )ی کتێبی هەمان پۆلدا باسی « ئاوەڵناوی چۆنی » کراوە ... لە لاپەڕە ( ٦٨ ــ ٧١ ) یشدا لە «پلەکانی ئاوەڵناوی چۆنی » کۆڵراوەتەوە ... ئەگەرچی ئەم باسانە هەندێ ناتەواوی‌و کەم‌و کورتییان تێدایە ، بەڵام بەگشتی بوختەو سەرکەوتوون ...

دانەرانی کتێبی « زمان‌و ئەدەبی کوردی » لە کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا لە ئاوەڵناوی نیشانە ( ل ٨٥ ــ ٨٦ ) دواون‌و لەو ڕایەدان لە

---

( ٣١ ) سەیر ئەوەیە مامۆستا صادق بەهائەدین ( ناو )ی لە ڕووی فۆرمەوە بەسەر ( سادە )و ( لێکدراو )دا دابەش‌کردووە ( بڕوانە : ل ٦٨ ) .

( ٣٢ ) عەبدوڵڵا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سندی ، زمان‌و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی سی‌یەمی ناوەندی بەغدا ، ١٩٧٦؛ بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦.



منتدى إقرأ الثقافي

ڕستەکانی ( ئەم گوڵە جوانە ) و ( ئەو مەڕانــە قەڵەون )دا ــ ( ئەم ... ە)و ( ئەو ... ە ) ئاوەڵناون‌و دواتر لە باسی « جیاوازیی ئاوەڵناوی نیشـــانەو ڕاناوی نیشانە »دا ( ل ٩٣ ــ ٩٥ ) وایان نیشان‌داوە ، ئەگەر بۆ ترێ « ئەمە جوانە »و « ئەوانە قەڵەون » ، ئەو دەم ( ئەمە )و « ئەوانە » جێنـــــــاوی نیشانەن ... هۆی ئەو هەڵەیە ئەوەیە ، کە زاراوەی ( جێناو ، ڕانـــــاو ــ یان وەك ( جێگری ناو ) تەماشاکردووە . ( Pronoun

لە کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەیی‌دا ( ل ١٩ ــ ٢٩ ) بە شێوەیێکی ساکار لەژێر سەرناوی « ئاوەڵناوی ژمارەیی »دا لە « ئاوەڵناوی ژمارەیی بنچی »و « ئاوەڵناوی ژمارەیی تەرتیبی »و « ئاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی » دواوەو لــە لاپەڕە ( ٣٢ ــ ٣٣ )شدا باسی « ئاوەڵناوی نادیـــار »ی دامەزراندووە ... ئەگەرچی وایەو هەندێ ژمارەی تەرتیبی‌و هەندێ جێناوی نادیار دەتوانـــن دەوری ئاوەڵناو ببینن ، بەڵام زوربەی زۆری ئەو باسانەو بەشی هەرە زۆری نموونەکان نە ئاوەڵناون‌و نە بوونەتە ئاوەڵناوو نە پیوەندییان بە ئاەڵناوەوە هەیە.

لە لاپەڕە ( ٢٧ ــ ٤٢ )ی کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی‌دا ، کە بـــاسی « ئاوەڵناوی بکەر » و « ئاوەڵناوی کراو »یان تێدا کراوە تا ڕادەیێکی بـــاش سەرکەوتووە . هەرچی ئــەو باســـانەشە ، کە لــە کتێبی پۆلی شەشەمـــی ئامادەییدا کراون ( ل ٤٧ ــ ٦١ )و بە ناوی « تەواوکردنی ناو بەئاوەڵناو» و « ئاوەڵناوی سادەو ئاوەڵناوی دارژاو »و « ئاوەڵناوی لێکدراو »ەوەن ڕاست‌و ڕەوان‌و زانستانەن ..

بەگشتی باسی ئاوەڵناو لــەو شـــەش کتێبەدا ، کـــە بەڕێوەبەرێتیـــی خوێندنی کوردی پێکی‌هێناوە ، هەرچەندە چەند کەم‌وکورتی‌و ناتەواوییـــــان تێدایە ، بەڵام لە ڕاستیدا بەرهەمێکی پوخت‌و بە سەروبەرەو لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ خوێندنی قوتابخانەکانە ، ئنجا لە زوربەی ئەو کارانەی بە زمانی کوردی لەم بارەیەوە بڵاوکراونەتەوە قووڵترو ڕەسەنترو زانستی‌یانەترە .

د . ئیبراهیـــم پوور لە لاپـــەڕە ( ٩ ــ ١٠ ) ی کتێبـــی « دستور زبان کردی » دا (٣٣) بە کورتـــی لەئاوەڵنـــاو دواوەو بەســـــــەر شـەش جـۆردا دابەشی کردووە : « ١ صفت مطلق » ( ل ٩ ) ؛ « ٢ ــ صفت فاعلی » (ل ٩) ؛ « ٣ ــ صـــــفت مفعولی » (ل ٩ ــ ١٠) ؛ « ٤ ــ صـــــفت نسبی » (ل ١٠) ؛ « ٥ ــ صفت مشبه » (ل ١٠) ؛ « ٦ ــ صفت تفضیلی » (ل ١٠)

نووسەر لەم کورتە باسەدا بەتایبەتی گرنگی بە ڕۆنانی ئاوەڵناو بـــــە یاریدەی پاشگر داوە لە بەشە دیالێکتەکانی مەهـــابادو سنـــــەو هـــەورامان‌و

---

( ٣٣ ) دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ؟



منتدى إقرأ الثقافي

کرماشاندا . به چەند دێڕێکیش لە پلەی بەراوردو پلەی باڵا دواوەو ئـەوەی دیاریکردووە ، کە لەو بەشە دیالێکتە ناوبراوانەدا نیشانەی ( ــ تر ) بـــۆ پلەی بەراوردو (ــ ترین) ، یاخود ( تەرین )یش بۆ پلەی باڵا بەکاردەبرێن .

لەو کتێبی ڕێزمانەدا ، کە د. نەسرین فەخریو د. کوردستان مو کریانی بۆ بەشی کـوردی زانکـۆی سەلاحەددین دایانناوە(٣٤) چاومان بە باســی ئاوەڵناو دەکەوێ ( بڕوانە : ل ٧٥ ــ ٩٤ ) .

باسی ئاوەڵناو لە کتێبی ناوبراودا گەلێك شوێنی جێگـەی ســـەرنجو ڕەخنەو لێدوانە ، بەڵام لێرەدا مەودای ئەوەمان نییە لە گشت ڕوویێکــــی بکۆڵینەوە . ئەو چەند تێبینییەی خوارەوە تەنیا هەندێ سەرنجی سەرەتاییو سەرپێییە بۆ نیشاندانی بەشێك لە کەمو کورتیو ناتەواوییەکانی .

لە سەرەتادا پێناسەی ئاوەڵناو بەو شێوە نادروستە کراوە ، کـــــە دەڵێ : « ئاوەڵناو ــ بەشێکی ئاخاوتنە ، شێوەو جۆری شـــت پیشاندەدا وە بە کاتەوە نەبەستراوە » . بەڵێ ڕاستە « ئاوەڵناو ــ بەشێکی ئاخاوتنە » ، بەڵام ئایا ئەو بەشە ئاخاوتنە چییە ؟ وشـــەیە ؟ ئامرازە ؟ دەســـتەواژەیە ؟ ڕستەیە ؟ ... لە لایێکی ترەوە نووسەرانی ئەو کتیبە دەبوو چاوێك بە کاری یەکتریدا بخشێننو زاراوەکانی ئەو بەرهەمە بچکۆلەیەیان یەکبخەنو زاراوەی « ئاخاوتن » لە پێناسەی ( ناو )دا نەبوایە بە « ئاخافتن » ( بڕوانە : ل ١٠ ).

ئەوەش ڕاستە ، کە دەڵێن ئاوەڵناو : «شێوەو جۆری شت نیشاندەدا» بەڵام ئەمە باش ئەوە ڕووننا‌کاتەوە خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاریدەکـــا لەسەر بناغەی لێکسیکی یان لە ڕێگای پێوەندیی شـــت بـــە شتی تــــرەوە رادەگەیەنرێ ... یاخود دەبوو پەنجە بۆ ئەوە درێژبکرێ ، کە ئاوەڵنـــاو وەك بەشە ئاخاوتنێك واتای چۆنیەتیو خاسیەتو دەلالەت نیشاندەدات . ئـــەم نیشاندانەش چ لە بەکارهێنانی ڕستەسازیداو چ لە تایبەتێتی وشەسازیدا ڕوونو ئاشکرا بەدیار دەکەوێ .

بێتو لە لاپەڕە ( ٧٥ )ی ئـەم بەرهەمەوە ، کـە پێناسەی « ئاوەڵناو »ی تێداکراوە بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕە ( ١٠ ) کە پێناسەی « ناو » ی تێدایە ، ئەوە دێتە پێش چاومان ، کە بۆ ئەو بەشە ئاخاوتنە چەمکی بە کاتەوە نەبەستران ڕەچاونەکراوەو وتراوە : « ناو : ئەو بەشەی ئاخافتنە ، کە کەتیکۆری ڕێزمانی ناسیاری ، نەناسیاری ، ڕەسەنو دۆخ دەگرێتە خۆی « ( ل ١٠ ) . لێرەدا بە پێویستی نازانە لە نادروستی گرتنی لایـەنی بەکاتەوە نەبەسترانەوە بـــۆ

---

( ٣٤ ) د. نەسرین فەخریو د. کوردستان موکریانی ، ڕێزمانی کوردی بــۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٢ .



منتدى إقرأ الثقافي

ئاوەڵناو بدوێم ، چونکە لە بەشی یەکەمی کتێبی « ڕێزمانی کوردی » دا بە دوورو درێژی لێی دواوە(٣٥) . بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم ، ئەگەر لەو ڕێگایەوە بۆ پێناسەی ئاوەڵناو بچین ، ئەوە دەبوو بۆ « ناو » یش هەمان مەسەلەی نەبەسترانەوە بەکاتەوە لە نەزەر بگیرایە ، چونکە ئەو بەشە ئاخاوتنەش بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە .

دوا بەدوای ئەو پێناسە لە جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە دواون . لە ڕووی پێکهاتنەوە ئاوەڵناویان بەسەر ( سادە ) و ( ناسادە ) دا دابەش کردووە . هەرچی (ناسادە)شە ( دارێژروا ) و ( لێکدراو )یان لێ جیاکردۆتەوە . ناتەواوی گەورەی ئەم باسە ، ئەوەیە شتی لاوەکی زۆر تێ ئاخنراوە ، کەچی هەندێ شتی سەرەکی و پێویستیش باس نەکراوە . بەوێنە ئەم باسە ( ١٦ ) لاپەڕەی لەو ( ٢٠ ) لاپەڕەیەی دەربارەی ئاوەڵناوە داگیر کردووە و ماکەکەی لە چەند لاپەڕەیێك تێناپەڕێ . ئەو زیادیەش ئەوەیە ، کە بۆ هەر پێشگرێك یان پاشگرێك چەند بەیتە شیعرێك یاخود چەند ڕستەیێکی وەرگیراو کراوەتە نموونە .... بەڵێ بۆ حاڵەتێکی ڕێزمانی نائاشکرا یان کەم باس کراو یان حاڵەتێك کە جێی گومان یا جێی دەمەتەقێ بێ ، دەقی وەرگیراو کردنە نموونە پێویستەو کەڵکی زۆرەو ڕێگەیێکی زانستی یە ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ، کە هەر وشەیەکمان وت ، یەکسەر چەند بەیتو ڕستەو دەقی بۆ بکەینە بەڵگە . ئێمە دەزانین ، کە وشەی دارێژراوی « نەخۆش » لە پێشگری ( ــ نە ) و ئاوەڵناوی سادەی (خۆش) پێکهاتووە . جا نووسەرانی کتێبی ناوبراو ، کە شیعرێکی (وەفایی ) یان هێناوەتەوەو وشەی « نەخۆش » ی تێدایە ( بڕوانە : ل ٧٩ ) چ شتێکی نوێو چ ڕوونکردنەوەیەکیان نیشانی خوێنەر داوە ؟ ... بەڵێ دەزانین ، کە پاشگری ( ــ ین ) دەچێتە سەر ناوی سادەو دەیکاتە ئاوەڵناوی دارێژراو ، وەك : ( زێڕ + ین = زێڕین ؛ ئاگر + ین = ئاگرین . . ) . تێناگەم د . نەسرینو د. کوردستان کە لە چەند بەرهەمێکەوە دەقو ڕستەیان بۆ ئەو وشانە وەرگرتووە (بڕوانە : ل ٨٠) ویستویانە بۆ خوێنەر چ شتێکی نهێنی ئاشکرا بکەن ؟ .. دانەرانی ئەو کتێبە دەبوو ئەسڵو گۆڕانی ئەو پێشگرو پاشگرانەیان بۆ خوێنەر ساغ بکردایەتەوە ، نەك بە کاری بێ سوودەوە خۆیانو ئەوانیش خەریك بکەن .

سەیرو سەمەرە ئەوەشە لە دیاری کردنی بارو دەوری هەندێ پێشگرو پاشگرو لە تێکەڵ کردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا هەڵەی زۆر دەبینرێ.

---

( ٣٥ ) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٤٢ ــ ٤٣ .



منتدى إقرأ الثقافي

بەڵێ ڕاستە پاشگری ( ــ ا نە ) دەچێتە سەر ناوی سادەو دەیکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو ، بەڵام وشەی « ژیرانە » ، کە کراوەتە نموونەی ئەو پێکهاتنە لە ئاوەڵناوو پاشگری ( ــ ا نە ) سازبووە ، نەك لە ناوو پاشــــگری ( ــ انــە ) ، چونکە ئاشکرایە ، کە وشەی « ژیر » ئاوەڵناوە ( بڕوانە : ل ٨١ ) ... یاخود لە نموونەی « پێشوو » دا وا دانراوە ، کە پاشگری ( ــ وو ) چووەتە ســـەر (ناو) ی سادەو کردویەتی‌یە ئاوەڵناوی داڕێژراو ... جێی گومانو دەمەتەقێ نی‌یە کە وشەی « پێش » ئاوەڵــکردارە ، نەك ناو ... ڕاستــە لە وشەی « ئاگراوی » دا ( ــ ا وی ) پاشگرە ، بــەڵام لە وشــەی « بەفــراوی » و « قوڕاوی » دا ( وی ) پاشگر نی‌یە . لە وشەی « بەفراوی » دا بریتی‌یە لــە وشەی « او » و نیشانەی ( ــ ی ) ئیزافە . لە وشەی « قوڕاوی » یشدا لــە وشەی « او » و پاشگری ( ــ ی ) ی ســیفەی نیسبی پێکهاتووە . وشــەی « ئاگراوی » وشەی داڕێژراوە لە وشەیێکی سادەو پاشگرێــك پێکهــاتووە. هەرچی « بەفراو » و « قوڕاوی » یە وشەی لێکدراون و یەکەمیان لــە دوو وشەی سادە سازبووە . (ــی)ی کۆتایی « بەفـــراو » یش نیشانەیێکـــی ڕێزمانی‌یەو دێتو دەڕوات .

پاش باسی ئاوەڵناوی داڕێژراو دەربارەی ئاوەڵناوی لێکدراو دواونو یازدە جۆریان دەستنیشان کردووە ... لێرەدا ناچارم کەمێك گلەیی لــەو مامۆستایانە بکەم ، کە دەربارەی شێـــوەی پێکهــاتنی ئاوەڵناوی داڕێژراوو لێکدراو دواون ، کەرەستەی کتێبی « وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا »یــان وەرگرتووە ( بڕوانە : ل ٦٥ ــ ٧٢ ، ٨٧ ــ ٨٩ (٣٦) و بە هەندێ دەستکاری‌یەوە بڵاوکردۆتەوەو کردوویانە بە ماڵی خۆیان ..

دووەم باسی ئاوەڵناو لە کتێبی ناوبراودا دەربارەی شێوەو جـــۆری وەرگرتنو وەرنەگرتنی نیشانە ڕێزمانی‌یەکانە ( ل ٩١ ــ ٩٢ )و بەشــــــی سێیەمیش بە ناوی « ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە » ( ل ٩٢ ــ ٩٤ ) یە . لەم دوو باسەدا ئەوە نەبێ ، کە هەندێ هەڵەی نووسەرانی زوو دووپات کراونەتەوە ، دەنا هیچ زانیاری‌یێکی نوێی ئەوتۆی تێدا نابینرێ ، کە شایانی باس بێت .

لە هەندێ لەو کارە زمانەوانیيانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت : د. قەناتی کوردۆ ، د. چەرکەزی بەکۆ ، د. کەریمی ئەیووبی‌و د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، د. مەکسیمی خەمۆ ، د. ڕ. ل. تســـابۆلۆڤ د. زارێ یــووســـــف .. نووسیویانە ، چاومان بە باسی ئاوەڵناو دەکەوێ .

د. قەناتی کوردۆ لــە سەرپاکــی ئــەو کتێبەیــدا کە لەبارەی وشــەسازیی

( ٣٦ ) د. ئەوڕحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنـــان لە زمـــانی کوردیـــــــدا بەغدا ، ١٩٧٧ .



منتدى إقرأ الثقافي

زمانی کوردییەوە نووسیونی باسی ئاوەڵناوی کردووە(٣٧) .. لەبەر ئەوەی کاری هەرە گەورەو دیاریو زانستی د. قەناتی کوردۆ کتێبی « دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو خواروو ) »ەو تێیدا وردتر لە بەرهەمەکانی تری لە ئاوەڵناو ( ٧٨ ـ ٨٦ )ی کۆڵیوەتەوە ، دەیکەینە کەرەستەو سەرچاوەی سەرەکیی ئەم باسەمان .

نووسەر لە سەرەتای باسی ئاوەڵناوی کتێبی « دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو خواروو ) »دا ( ل ٧٨ ) زۆر بە کورتی لەو لێکۆڵینەوانەی ف. یووستی ؛ ڕ. جاردین ؛ د. ن. مەکەنزی ؛ ئەرنست مەکارۆس ؛ ل. فۆسوم دواوە ، کە لەبارەی ئاوەڵناوەوە نووسیویانە . لێرەدا مامۆستا کوردۆ دەربارەی ئەو کارانە نەك هەر زانیارییەکی ئەوتۆی نەخستۆتە پێش چاو ، بەڵکو گەلێ بەرهەمی دیارو ئاشکراشی یادداشت نەکردووە . بەوێنە ، وەك نووسینەکانی مامۆستایان : تۆفیق وەهبی ؛ نووری عەلی ئەمین ..

مامۆستا کوردۆ دوای ئەو کورتە گەشتە هەندێ زانیاریی گشتی سەبارەت بە ئاوەڵناو تۆمار کردووەو ئەمجا ئاوەڵناوی بەسەر دوو جۆردا

---

( ٣٧ ) بە نموونە ، بڕوانە :

✻ بە زمانی کوردی :

أ ـ د. قەناتی کوردۆ ، گراماتیکا زمانێ کوردی ، چاپی سێیەم ، یەریڤان ، ١٩٦٠ ، ل ٨٤ ـ ٩٦ .

ب ـ د. قەناتی کوردۆ ، زمانێ کوردی ، چاپی چوارەم ، یەریڤان ، ١٩٧٠ ، ل ٥٠ ـ ٥٤ ، ٨٩ .

ج ـ د. قەناتی کوردۆ ، زمانێ کوردی ، فرانکفۆرت ١٩٨١ ، ل ٥٦ ـ ٥٩ .

... هتد .

✻ بە زمانی ڕووسی :

١ ـ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٢٦ ـ ١٣٨ .

٢ ـ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٢٨ ـ ٣٠ .

٣ ـ د. قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٧٨ ـ ٨٦ .

...و هەندێکی تر .



منتدى إقرأ الثقافي

دابەش‌کردووە : ١ ـ ئاوەڵناوی چۆنێتی ؛ ٢ ـ ئاوەڵناوی نیسبی .

نووسەر دوو چەشن ئاوەڵناوی چۆنێتی لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی ـ کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو ـ کوردی‌دا دیاری‌کردووە :

١ ـ ئاوەڵناوی چۆنیەتی ، کە بۆ هەردوو دیالێکتەکە گشتی‌یە . زوربەی ئاوەڵناوەکانیش لەم بەشەن :

أ ) ئاوەڵناوی هاوشان لە رووی فۆنەتیکەوە . وەك : رەش ، سپی ، ئاڵ ، باش ...

ب ) ئاوەڵناوی لە رووی فۆنەتیکەوە جیاواز ، بەڵام خاوەنی یەك رەگ وەك : هشك ـ وشك ، هوورد ـ ورد ، زەر ـ زەرد ...

٢ ـ ئاوەڵناوی لە رووی رەگەوە جیاواز . وەك :

رند ـ جوان
تژی ـ پڕ
قۆچاخ ـ ئازا

نووسەر بەدوا ئەو لێدوانەدا هاتۆتە سەر باسی بوونی ئاوەڵناوی چۆنی بە ناوو ئەو رێگایانەی دیاری‌کردووە ، کە ئەم کارەی پێ سازدەبێ

لە لاپەرە ( ٨٠ ـ ٨٢ )دا لە پلەکانی ئاوەڵناو دواوەو ئەو رێگایانەو ئەو نیشانانەو ئەو ئامرازو وشانەی دەست‌نیشان کردووە ، کە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردی‌و هەندێ بەشە دیالێکتدا پلەی بەراوردو پلەی باڵای ئاوەڵناوی چۆنێتی سازدەکەن . هەرچەندە د. کوردۆ لەم باسەدا زانیاریی باش‌و نوێی تۆمارکردووەو بە شێوازێکی زانستی‌یانەی لێ کۆڵیوەتەوە ، بەڵام کەمو کورتی لەوەدایە هەندێ حاڵەتی گرنگی ناونەبردووە(٣٨)و بەپێچەوانەشەوە حاڵەتی ئەوتۆی بە پلەی بەراورد یان بە پلەی باڵا داناوە ، کە جێی گومانن . بەوێنە لە لاپەرە (٨١)دا وا رادەگەیەنێ ، کە گوایا « پلەی بەراوورد دەشێ بە کەرەستەی لێکسیك دەرببڕدرێ . بەنموونە ئاوەڵکرداری (دها) لە کرمانجیی ژووروودا و (هێشتا) لە کرمانجیی خوارووداً لە پێش ئاوەڵناوی چەسپو دادەنرێ‌و ئەم حاڵەتە سازدەکرێ . وەك : ( ئەزێ ، قیزا دها بدەو بخەمدزم ـ من کچێکی هێشتا جوانم دەوێ ؛ ئەوا گوندا دها مەزنە ـ ئەم لادێ‌یە هێشتا گەورەیە ) »، وای بۆ دەچم نووسەر لێرەدا بەتەواوی کەوتۆتە ژێر باری زمانی رووسی‌یەوەو بە هەڵە ( دها )ی وەرگێڕاوتە سەر زمانی‌و دیالێکتی کرمانجیی خواروو . پێویستە

( ٣٨ ) بڕوانە لاپەرە ( ٩٨ ـ ١٠٧ )ی ئەم کتێبە .



منتدى إقرأ الثقافي

ئەوەش لەیاد نەکەین ، ( دھا ) لە زمانی تورکیدا پلەی بەراوردە

بەدوا باسی پلەکانی ئاوەڵناودا ، لە ئاوەڵناوی نیسبی دواوە ( ل ٨٣ ــ ٨٦ )و ئەوەی دیاری کردووە ، کە پاشگری (ــی) ، (ــین) ، (ــۆکی)و پێشگری (بێــ)و ئامرازی (نا) ، (نە) یاریدەی دارشتنی ئاوەڵناوی نیسبی دەدەن و ئنجا هاتۆتە سەر لێکۆلینەوە لە چۆنیەتی پێکهاتنی ئاوەڵناوی لێکدراوو چەند رێگایێکی دەستنیشان کردووە . ناتەوایی بەرچاوی ئەم بەشەش ئەوەیە ، کە هەندێ پاشگری دیارو چالاك یادداشت نەکراوەو چەند حالەتێکی رۆنانی ئاوەڵناوی لێکدراو لەبیر کراوە ...

بەگشتی دەتوانرێ باسی ئاوەڵناو لە کتێبی ناوبراوی د. قەناتی کوردۆدا بە لێکۆلینەوەیێکی سەرکەوتووی کەرەستە دەوڵەمەند دابنرێ و بەتایبەتی یش رووی بەراوردکاری دیالێکتەکانی زمانی کوردی بە سەرچاوەیێکی زانستی وەربگیرێ .

د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ )یش لە کتێبی « زمانی کوردەکانی ئازربایجان »(٣٩) و کتێبی « بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان »دا(٤٠) باسی ئاوەڵناوی کردووەو دواتریش لە کتێبی «زمانی کوردەکانی سۆڤێت»دا (٤١) باشتر لێی دواوە . مامۆستا بەکۆ لەم کتێبەی دواییدا لەسەر بناغەی کەرەستەیێکی زۆری بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤیت و بەراوردکردن لە نێوانیاندا زانایانەو شارەزایانە لە ئاوەڵناوی کۆلیوەتەوە ( ل ١١٥ ــ ١٢٦ ).

نووسەر بە خستنە پێش چاوی چەند تایبەتی تێك دەستی بە باسی ئاوەڵناو کردووەو ئەوەی نیشانداوە،کە ئاوەڵناو لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی سۆڤێتدا لە رووی روخساردوە هیچ جیاوازی یێکی لەگەڵ ناودا نی یەو چ ئاوەڵناوو چ ناوو هەروەها ئاوەڵکرداریش دەلوێ کۆتاییان بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن بێت ... لە بەردەوامیی ئەم باسەیدا دەڵێ : « جیاوازی لە نێوان ئەو بەشە ئاوخاوتنانەدا لە گەیاندنی واتایانداو بینینی دەوریاندا بەدەردەکەوێ و هەروەها ئاوەڵناو جنس و ژمارەو دۆخ و ناسیاوی و نەناسیاوی نی یەو هەمیشە ئەرکی دیارخەر دەبینێ » ( ل ١١٥ ) .

---

( ٣٩ ) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٥٢ ــ ٥٧ .

( ٤٠ ) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ٦٣ ــ ٦٩ .

( ٤١ ) د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ ــ ١٢٦ .



منتدى إقرأ الثقافي

مامۆستا چەرکەزی بەکۆ لە لاپەڕە ( ١١٦ ـ ١٢٢ )دا باسی ( پلەکانی ئاوەڵناو ی کردووە . بە نموونەو بەڵگەوە ڕوونی کردووەتەوە کە لە تێکڕای بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤێتدا ( ـ تر ) نیشانەی سەرەکیی پلـەی بەراوردە. هەرچی بۆ پلەی باڵایە،لەم بەشە دیالێکتانەدا ئەگەرچی نیشانەیێك نییە پێی دەرببڕێ ، بەڵام چەند ڕێگەیێکی تەحلیلی ( سیمانتیکی ) هـەیـە بۆ نیشاندانی ئەو دۆخە .

پاش باسی پلەکانی بەراورد ، بە کورتی دەربارەی ئاوەڵنـاوی نیسبی دواوە ( ل ١٢٢ ـ ١٢٦ ) . ناتەواویی دیاری ئەم باسە ئەوەیە ، نووسەر تەنیا ناوی چەند پاشگرێکی کەمی بردووە ، کە یاریدەی ڕۆنانی ئاوەڵناوی نیسبـی دەدەن و بە هیچ چەشنێك لە ئاوەڵناوی لێکدراو نەدواوە ..

لە کتێبی « دیالێکیتی کوردی موکری »دا ، کە د. کەریمی ئەیووبی د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا دایانناوە (٤٢) ، باسی ئاوەڵناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا کراوە ( بڕوانە : ل ٣٨ ـ ٤٣ ) .

نووسەرانی ناوبراو لە سەرەتادا لەوە دواون ، کە ئەگەر ناوو ئاوەڵناو پێکەوە پێن ، ئاوەڵناوەکە نیشانەی ( ـەکە)ی ناسیاوی وەردەگرێ ، بـەڵام حاڵەتەکانی تری ناو ( جنس ، دۆخ ، ژمارە ، نەناسیاوی ) وەرناگـرێ ... دواتریش دەڵێن : « لەباری هەبوونی ئاوەڵناودا نیشانەی ( ەکە )ی ناسیـاوی ناچێتە سەر ناوەکە ، بەڵکو بە ئاوەڵناوەکەوە دەلکێ ، وەك : کچە جوانەکە ؛ کراسە سوورەکە .. » ل ٣٨ ـ ٣٩ ) .. ناتەواویو هەڵەی ئەم بـاسـە لە دوو سەردەوەیە :

١ ـ ئاوەڵناو تەنیا هەر (ـەکە)ی ناسیاوی وەرناگرێ ، بەڵکو نیشـانەی تریش وەردەگرێ . بەوێنە ، دەوترێ : منداڵە زیرەکەکان ؛ کیژۆڵە جوانەکان ... بێچووە عەیبارێك ... (٤٣)

٢ ـ کاتێ ناوو ئاوەڵنـاو پێکەوە دێـن ، نیشانـەی ( ـ ەکە ) هەر بە ئاوەڵناوەوە نالکێ ، بەڵکو دەچێتە سەر ناوەکەش . بەنموونە : کچەکە جوانە؛ کراسەکە سوورە .. (٤٤) .

نووسەرانـی ئـەم کتێبـــە لە باســـی پلەکانـــی ئاوەڵنـــاودا ڕاست بۆ ئەوە چوون ، کە جگە لە نیشانەی ( ـ ترین ) ، هەروەها بە یاریدەی وشەی « هەرە » ، « لە هەموو » ، « لـە هەمـوان » ، « لـە تەواویـان »و

( ٤٢ ) د. کەریمی ئەیووبی ، د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، بەشە دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

( ٤٣ ) بڕوانە لاپەڕە ( ١١٧ ـ ١٢٢ )ی ئەم کتێبە .

( ٤٤ ) بڕوانە لاپەڕە ( ١١٧ ـ ١١٨ ، ١٢١ )ی ئەم بەرهەمە .



منتدى إقرأ الثقافي

نیشانەی ( ـ تر )ەوە پلەی باڵا سازدەبێ .. بەڵام ئەوەیان لەبیر کردووە ، کە « لە گشت » ، « لە تێکڕا » ، « لە سەرپاکی » ... یش هەمان دەور دەبینن .

شایانی باسە ، د. کەریمی ئەیوبی‌و د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا . بە شێوەیێکی زانستی‌یانە لە چۆنیەتیی ڕۆنانی ئاوەڵناو کۆڵیونەتەوەو بە سەر سادەو داڕێژراوو لێکدراودا دابەشیان‌کردووە .. بە دوورو درێژی لەو پاشگرانە دواون ، کە ئاوەڵناوی داڕێژراو سازدەکەن ( ل ٤٠ ـ ٤١ ) و ئەو ڕێگایانەیان دەست‌نیشان کردووە کە ئاوەڵناوی لێکدراویان پێ دروست‌دەکرێ ( ل ٤١ ـ ٤٣ ) . ئەگەرچی نووسەرانی ئەم کتێبە هەندێ زانیاریی نوێ‌و بەکەڵکیان پێشکەش‌کردووەو لە گەلێك شوێنی ئەو باسەدا سەرکەوتوونو ژمارەیێك نموونەی جوانو لەباریان دەربارەی ئاوەڵناوی داڕێژراوو لێکدراو هێناوەتەوە ، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەو پوختی‌یەشدا هێشتا بێ کەم‌وکورتی نی‌یە :

یەکێ لەو ناتەواوی‌یانە ، ئەوەیە هەندێ پاشگر یادداشت نەکراونو لە دیاری‌کردنی دەوری هەندێکیشیاندا تێکەڵ‌کردن بەدی دەکرێ . بەوێنە وایان داناوە کە پاشگری (ـدار)و (ـباز) دەچنە سەر ناوی سادەو دەیکەنە ناوی داڕێژراو ( ل ٢٨ ) . ڕاستە ، ئەو دوو پاشگرە بە ناوەوە دەلکێن ، بەڵام ئەوان ئەوەیان لەیادکردووە ، کە هەندێ جار پاشگری (ـدار) ناوە سادەکە دەکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو ، وەك : « ناودار ، نازدار ... » . پاشگری (ـباز)یش بە زۆری ناوە سادەکە دەکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو ، نەك ناو . وەك: « فێڵباز ، کۆترباز ، مێباز ... » . جگە لە چەند وشەیێکی کەم کە دەبنە ناو ، وەك : « سەرباز ... » .

ناتەواوی‌یێکی دی ئەو باسە ، ئەوەیە هەندێ پێکهاتنی گرنگی ئاوەڵناوی لێکدراویان لەبیرکردووە ، وەك : ( گەردنبلوور ، بەژنچنار ، باڵاعەرعەر ... ) کە لە دوو ناو پێکهاتون . یاخود ( ڕەش پۆش ، ڕاستگۆ ... ) کە لە ئاوەڵناوو ڕەگی کردار سازبوون .

د . مەکسیمی خەمۆ لەو کارە زانستی‌یەیدا ، کە بە ناوی « زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق » ەوە بڵاوی‌کردۆتەوە(٤٥) لە باسی ئاوەڵناو ( ل ٣٣٠ ـ ٣٣١ ) دا تەنیا لە پلەکانی ئاوەڵناو دواوەو ئەویش زۆر بەکورتی .

---

( ٤٥ ) د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی « وڵاتانو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك‌و ناوەڕاست » ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٢٨٣ ـ ٣٨٢ .



منتدى إقرأ الثقافي

د . ڕ . ل . تسابۆلۆف له کتێبی « لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوه » دا(٤٦) باسی ئاوەڵناوی کردووه ( ل ١٤ ــ ١٨ ) . ڕووی باش‌و سەرکەوتووی ئەم کاره بەتایبەتی لەوەدایه نووسەرەکەی لێکۆڵینەوەیێکی مێژوویی سەبارەت هۆی وێکچوونی فۆرمی ناوو ئاوەڵناوی کردووه ... بەشێکی زۆری ئەو پاشگرانەی دیاری کردووه ، که یاریدەی دارشتنی ئاوەڵناو دەدەن‌و لەگەڵ ئاوێستاو فارسیی کۆندا بەراوردی کردوون ... هتد . ناتەواوی دیاریشی ئەوەیه،هەندێ کێشەی زۆر گرنگی باس‌نەکردووەو چەند باسێکی جیاوازی بێ‌گومانی تێکەڵ به یەك کردووه .

ساڵێك لەمەوبەر د. زاریێ یوسف بەناوی « دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی » یەوه کتێبێکی بلاوکردەوه (٤٧) و له بەشه ئاخاوتنی ئاوەڵناو (بڕوانه: ل ٣٨ ــ ٣٩ ) دواوه تێیدا .

له باسی ئاوەڵناوی ئەم کتێبەدا نووسەر له سەرەتادا ناوی کێشانەی هێناوه که پێوەندیان به ئاوەڵناودوه هەیەو دواتریش به کورتی له هەر یەکێکیان دواوه . نووسەر لە ڕووی واتاوه ( ئاوەڵناوی چۆنێتی )و ( ئاوەڵناوی نیسبی ) جیاکردووەتەوه . له ڕووی ڕۆنانیشەوه ( ساده )و ( دارێژراو ) و ( لێکدراو ) ی دیاری‌کردووەو دواتریش له لاپەڕەکانی ( ٤٣ ــ ٥٣ ) دا باسی ئەو پێشگرو پاشگرانەی کردووه ، کە یاریدەی دارشتنی ئاوەڵناوی دارێژراو دەدەن‌و لەو ڕێگایانه دواوه ، که ئاوەڵناوی لێکدراویان پێ دروست دەکرێ .

نووسەر له باسی ( پلەکانی ئاوەڵناو )دا به پێی سروشتی زمانی کوردی سێ پلەی دەستنیشان کردووه ( پلەی چەسپیو )و ( پلەی بەراورد )و ( پلەی بالا ) ...

ئەگەرچی د. زاریێ یوسف له کتێبی « دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی »دا به کورتی له ئاوەڵناو دواوه ، بەڵام ئەو زانیارییانەی تۆماری کردوون ، بەگشتی ڕاست‌و ڕەوانن .

له باسی ئەو کارانەشدا ، که به زمانه ڕۆژئاواییەکان لەبارەی زمانی کوردییەوه بلاوکراونەتەوه، ئاوڕێك له بەرهەمەکانی:د. ئەرنست مەکارۆس‌و د. مەکەنزی‌و د. جۆیس بلۆ دەدەینەوه .

---

( ٤٦ ) د. ڕ.ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوه ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

( ٤٧ ) د. زاریێ یوسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ .



منتدى إقرأ الثقافي

د. ئەرنست مەکارۆس لە لاپەڕە ( ٤٩ ــ ٥١ )ی کتێبـــی « ڕێــزمانی کوردی »دا(٤٨) بە کورتی چەند زانیاری‌یێکی .کەمی لەبارەی ئاوەڵنـــاوەوە تۆمارکردووە ، کە پێوەندی بـــە چۆنێتی وەرگرتنی نیشانەی ناســـیاوی‌و نەناسـیاوی‌و کۆو پلەی بەراوردو پلەی بالآو جێناوی لکاوەوە هەیە .

د. مەکەنزی لە سەرەتای باسی ئاوەڵناوی ئەو کتێبەی ســاڵی ١٩٦١ لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بلاوی‌کردووەتەوە(٤٩) لەوە دواوە ، کـــــــە ئاوەڵناو بەدوا ناودا دێت‌و لە حاڵەتی ئیزافەدا دەبێتە دیارخـــەر ( ل ١٦٣ ــ ١٦٤ ) . بەدوا ئەمەدا باسی پلەکانی ئاوەڵناوی کردووەو وای نیشانداوە ، کە لە بەشە دیالێکتەکانی سوورچی‌و ئاکری‌و ئامێدی‌و زاخــۆ ... دا (ــتر) نیشانەی بەراوردەو بۆ سازکردنی پلەی بالآش مۆرفێمی (ێ) دەخرێتە ســەر فۆرمی پلەی بەراورد . هەرچی لە بەشە دیالێکتی ڕەواندزیشدایە ، وشــەی « هەرە » یاریدەی پێکهێنانی ئەو پلەیە دەدا ( ل ١٦٤ ) .

نووسەر لە لاپەڕە ( ١٦٤ ــ ١٦٦ )دا باسی وشەکانی : چ ، چەنـــد ، فلان ، گەلەك ، هەموو / هەمی .(ئەڤ ) هندە ، هەر،کی ... ی کردووەو بە « ئاوەڵناوی دیاری‌کراو »ی لەقەڵـــەم داون . وشەکانی « دی(کـــە) »و « وە (تو ڤ »و « وەصا »یشـــی هەر لەگەڵ ئەم دەستەیە ژمـــاردووەو وای ڕاگەیاندووە که یەکەمیان لە تێکڕای بەشە دیالێکتەکانی ژووروودا بەکاردێ‌و دووەمیان لە ناوچەی ئاکری‌و سێ‌یەمیشیان لە شێوەی زاخۆدا ... پاشـــان هاتۆتە سەر باسی وشەکانی : ئەڤ ، ئەو ... و بە « ئاوەڵناوی نیشانە » ی داناون ( ل ١٦٦ ــ ١٦٨ ) .

ئەوەی د. مەکەنزی لەبارەی «ئاوەڵناوەوە» نووسیویێتی ، نەك هەر پڕ کەم‌وکورتی‌یە ، بەڵکو هەڵەی گەورە گــەورەشی تێدایە . ناتەواوی هــەرە دیاری ئەوەیە ، باسی « ئاوەڵناوی چۆنێتـــی »و « ئاوەڵنـــاوی نیسبی » ی نەکردووە ، کە دوو جۆری سەرەکی‌و بنەڕەتی‌و دیارن ؛ یاخود لەو پێشگرو پاشگرانە نەدواوە ، کە یاریدەی ڕۆنانی ئاوەڵناوی داڕێژراو دەدەن‌و شێوازی پێکهاتنی ئاوەڵناوی لێکدراویشی یادداشت نەکردووە ... هەڵەی بەرچاویش ئەوەیە ، هەندێ وشەی هەمەجۆر ، کە سەر بە بەشە ئاخاوتنی جیاوازن ، بە ئاوەڵناو داناوە ...

---

( 48 ) Ernest N. Mccarus , A Kurdish Grammar , New - York , 1958, PP. 49 - 51 .

( 49 ) D. N. Mackenzie , Kurdish Dialect Studies , London , 1961 , PP. 163 - 168 .



منتدى إقرأ الثقافي

د. جۆیس بلۆ لە کتێبی
MANUEL DE KURADE ( Dialecte Sorani ) دا(٥٠)
هەندێ زانیاریی بەکەڵکی تۆمارکردووە ، وەك : هاتنی ئاوەڵناو بەدوا ناودا لە دۆخی ئیزافەدا ؛ چۆنێتی بەدوا یەکتردا هاتنی چەند ئاوەڵناوێك بە یاریدەی نیشانەی (ـی)ی ئیزافەو (و)ی پێوەندی ؛ بوونی ئاوەڵناو بە ئاوەڵکردار ، ئەو حاڵەتانەی ئاوەڵناو پێش ناو دەکەوێ ..

وێڕای ئەو چەند بەرهەمەی لە سەرەوە لێیان دواین ، هەندێ کتێبو نامیلکەو وتاری دیکەش هەن کە باسی ئاوەڵناویان تێداکراوە ، بەڵام بەداخەوە لێردا مەودا نی یە باسی هەموویان بکەین

* * *

بەم جۆرە ـ واتە دوای کورتە گەشتێك بەو کارانەدا کە دەربارەی ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا نووسراوە ـ ئەوەمان بۆ دەرکەوت ، زوربەی ئەو باسانەی لەباردی ئەم کێشەیەوە نووسراون ، سادەو ساکارنو ناتەواویو هەڵەی زۆریان تێدایەو بە لای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوونو تیشکی ڕووناکی یان ئاراستەی گەلێك ڕووی نەکردووەو ئەنجامێکی سەرکەوتوویان وەدەست نەهێناوە ... لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوە درێژبکەین ، کە چەند بەرهەمێك هەیە ، بەتایبەتی ئەوەی د. قەناتی کوردۆو د. چەرکەزی بەکۆو ئەحمەد حەسەن ئەحمەدو نووسەرانی کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکان... لەسەر بناغەی کەرەستەی باشو شێوازی زانستی نووسراون . هەرچەندە ئەو جۆرە هەولانە هەندێ ڕووی ئاوەڵناویان ساغ کردووەتەوە ، بەڵام هێشتا چەندین نادیارییو تەمومژ بەسەر ئەو کێشەیەی زمانەکەمانەوە هەیەو ئاشکرا نەکراونو نەڕەوێنراونەتەوەو تەنانەت هەندێ شتی زۆر ئاشکراش دەبینین کە بە هیچ چەشنێك نەخراونەتە سەر کاغەز .

ئەو نووسەرانەی پێناسەی ئاوەڵناویان کردووە ، ئەگەرچی زوربەیان مەسەلەی وەسفیەتیان لە نەزەر گرتووە ، بەڵام هیچ کامێکیان ئەوەیان ڕوون نەکردووەتەوە خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاری دەکا لەسەر بناغەی واتای لێکسیکی یان لە ڕێگای پێوەندی شت بە شتی ترەوە ڕادەگەیەنرێ .. یاخود پەنجەیان بۆ ئەوە درێژ نەکردووە ، کە ئاوەڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك واتای چۆنێتیو خاسیەتو دەلالەت نیشاندەدا

بەشێکی زۆر لە زانایانی ڕۆژئاوا لە جۆرەکانی ئاوەڵناو نەدواون . ئەوانەش کە باسیانکردووە بە لای مەسەلە بنەڕەتی یەکەدا نەچوونو شتی لاوەکی وایان هێناوەتە گۆڕێ کە پێوەندی بە ئاوەڵناوەوە نی یە ... زانایانی یەکێتی سۆڤێت ئەگەرچی باش لە جۆرەکانی ئاوەڵناویان کۆڵیوەتەوەو دوو

( 50 ) Joyce Blau , Menuel De Kurde , Paris , 1980 , PP. 60 - 62 .



منتدى إقرأ الثقافي

جۆری سەرەکی‌یان دیاری کردووە: (١ ـ ئاوەڵناوی چۆنێتی ؛ ٢ ـ ئاوەڵناوی نیسبی ) ، بەڵام بە هیچ چەشنێك لە ئاوەڵناوی نادیار نەدواون ، کە ئەمیش دوو چەشنە : ( ١ ـ ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە ؛ ٢ ـ ئاوەڵناوی نادیاری دیاری‌کردن ) . زوربەی نووسەرانی لای خۆشمان وشەو حاڵاتی ڕێزمانی‌و بەشە ئاخاوتنی هەمەجۆریان لەژێر سەرباسی جۆرەکانی ئاوەڵناودا باس‌کردووە .

لە باسی ئاوەڵناو لە ڕووی ڕۆنانەوەدا چەند کێشەیێك دەبینرێ :

١ ـ هەندێ لە نووسەران نە باسیان‌کردووەو نە بە لایدا چوون .

٢ ـ تێکرای ئەو نووسەرانەی باسی ئەو پێشگرو پاشگرانەیان کردووە، کە یاریدەی سازکردنی ئاوەڵناوی داڕێژراو دەدەن ، ئەگەرچی لە بەشێکی زۆریان دواون ، بەڵام چەند پاشگرو پێشگرێکی چالاك هەن ، ناویان نەبردوون .

٣ ـ تەنانەت ئەوانەش کە بە باشی‌و دوورو درێژی لە جۆرەکانی ئاوەڵناوی لێکدراو دواون ، گەلێ شێوە پێکهاتنی دیارو ئاشکراو گرنگیان یادداشت نەکردووە .

٤ ـ گەلێ جار ئەوە بەرچاو دەکەوێ ، کە ئاوەڵناوی داڕێژراو بە لێکدراو دانراوەو بە پێچەوانەشەوە لێکدراو بە داڕێژراو ناوبراوە .

مەسەلەی باسی پلەکانی ئاوەڵناو دوو تێبینی بنەرەتی لێ‌پەیدادەبێ:

١ ـ لە هەندێ کاردا کێشەی«پلەکانی ئاوەڵناو»لە بەشی «وشەڕۆنان»دا باس‌کراوەو لە چەند بەرهەمێکیشدا لە باسی « جۆرەکانی ئاوەڵناو » دا لێی‌کۆڵراوەتەوە .. وەك ئاشکرایە ، لە هەر سێ پلەکانی ئاوەڵناودا مەبەست هەر یەك دەلالەتە ، بەڵام جیاوازیی پلەی بەراوردو پلەی باڵا لەگەڵ پلەی چەسپیودا،ئەوەیە ئەوان خاسیەتی نیسبی‌یان تێدایە.پلەی باڵا شتێك بەجیا نیشان‌نادەن ، بەڵکو نیشانی بەراوردیان دەدەن لەگەڵ شتی تردا . لەبەر ئەوەی هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشان‌دەدەن ، بۆیە ڕاست نی‌یە وەك وشەی جیاجیا تەماشا بکرێن ، واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن ، بەڵکو فۆرمی جۆربەجۆری یەك وشە دەردەبڕن . کەوابوو مسەلەکە وشەگۆڕی‌یە، نەك وشەڕۆنان .

٢ ـ ئەگەرچی باسی پلەکانی ئاوەڵناو لە زوربەی باسە ڕێزمانی‌یەکاندا بەدی دەکرێ ، بەڵام جگە لە هەڵەی زۆر ، ئەو ناتەواوی‌یەش دەبینرێ کە گەلێ ڕێگەی پەیدابوونی ئەو پلانە ناونەبراون .

ئەمانەو گەلێك کێشەو باس‌و نائاشکرایی دی لە باسی ئاوەڵناودا دەبینرێن . جا هیوامە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا توانیبێتم بەشێکی زۆریان ساغ‌بکەمەوەو بگەیەنمە ئەنجام .



منتدى إقرأ الثقافي

## ـ ٢ ـ

# لێکۆڵینەوەکانی خۆم لەبارەی (( ئاوەڵناو ))ەوە

## ئاوەڵنــاو

ئاوەڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك ، واتای چۆنێتیو خاسیەتو نیشانــە رادەگەیەنێ . لە ئاوەڵناودا ئەم راگەیاندنە چ لە بەکارهێنانی رستەسازیداو چ لە تایبەتێتی وشەسازیدا روونو ئاشکرا بەدیاردەکەوێ .

لە مەیدانی رستەسازیدا جیاوازیی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا لەوەدایە ، کە بەر لە هەر شت بە بەردەوامــی وەك دیــارخەر بەکــاردەبرێ . ئاوەڵناو لــە سروشتیدا دیارخەری خاسیەتی ناوە .

ئاوەڵناو لەپاڵ ئەوەدا کە دەوری دیارخەر دەبینێ ، هەروەها دەشتوانێ وەك بەشێکی گوزارە خۆی بنوێنێ . بەڵام لەبەر ئەوەی بەشە ئاخاوتنی دیش دەتوانن ببنە بەشێکی گوزارەو لە نێویاندا ناویش ، بۆیە لە راستیدا ناتوانرێ ئەو ئەرکە وەك تایبەتێتی سەربەخۆی ئاوەڵناو تەماشابکرێ .

لەبەرئەوی ئاوەڵناو وەك ئەندامی دی رستە کەم بەکاردەهێنرێ(١) ،بۆیە دەبینین مەیدانی ئەرکو وەزیفەی لە هی ناو تەسکترە .

لە حالێکدا ئەگەر دوو ئاوەڵناو یان پتر بەیەکەوە بێن ، ئەوە هیچ یەکێکیان لەژێر باری ئەوی دیاندا نیـیــە ، بەڵکو هەردوووکیان سەر بە ناوەکــەن . بەوێنە :

---

( ١ ) بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ئەرکی ئاوەڵناو لە رستەدا ، بروانە :
أ ــ د. کوردستان موکریانی ، ئاوەڵناو لە رستەی کوردیدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٥ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٣٩ ــ ٤٤ .
ب ــ د. کوردستان موکریانی ، سینتاکسی رستەی سادە لە زمانــی کــوردیدا ، بــەغدا ، ١٩٨٦ ، ل ٩٨ ــ ٩٩ ؛ ١٠٥ ــ ١٠٧ ؛ ١١٥ ــ ١١٦ ؛ ١٢٤ ــ ١٢٦ .
.. و هەندێکی دی .



منتدى إقرأ الثقافي

کوڕێکی چالاکو زیرەك .
شووتی‌یێکی سووری شیرین .
پیاوێکی ئازاو نەبەرد .
کچی جوانو نازدار .
... هتد .

لە باری وشەسازی‌یەوە ئاوەڵناو لەچـــاو ناودا لە بوونی فۆرمـــی هەمەچەشندا هەژارە .

لە ڕووی فۆرمەوە ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا هیچ جیاوازی‌یێکی لەگەڵ ناودا نی‌یە ــ واتە هیچ نیشانەیێکی ڕێزمانی نی‌یە ئاوەڵناو لە ناو جیابکاتەوە(٢)و دەشێ چ ئاوەڵناوو چ ناو بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن کۆتایی‌یـــان بێت . بۆ نموونە :

گەورە ، سپی ... ورد ، ڕاست ...
بەڕە ، شووتی ... کورد ، دەست ...

جیاوازیی ئەم دوو بەشە ئاخاوتنە لە گەیاندنی واتاو بینینی ئەرکـــدا دەردەکەوێ‌و هەروەها ئاوەڵناو دۆخو جنس‌و ژمارەی نی‌یە(٣)و بەڵام نـــاو هەیەتی دەلالەتی دۆخو جنس‌و ژمارەی ئاوەڵناو دەمێك بەدی‌دەکرێ ، کـە ناوەکە دیاری‌دەکا ــ واتە دەلالەتی دۆخو جنس‌و ژمارەی ئاوەڵناو لـــە ڕێی

---

( ٢ ) لە زمانی ئینگلیزی‌دا کۆتـــایی ( ly ) ئاوەڵنـــاو لە نـــاو جیادەکاتەوە ( بڕوانە : ئا. ئی. سامیرنیتسکـی ، مۆرفۆلۆژیـی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٥١ ) . لە زمانی ڕووسی‌یشدا ئاوڵنـــاو خاوەنی چەند نیشانەیێکی کۆتـایی‌یـە ( بڕوانـە : ن. س. ڤالگینا ، د. ئێ. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا . ف. ف. تساپکێڤیچ ، زمانی ڕووسـی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ل ٢٠٢ ــ ٢٠٣ ) .

( ٣ ) ئاوەڵناو لە زمانی ئینگلیزی‌دا دۆخو ژمارەی نی‌یە ( بڕوانە : ئا . ئی. سامیرنیتسکی ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ١٥٠ ) . لە زمانی ڕووسیشدا ئەگەرچی ئاوەڵناو خاوەنی دۆخو جنس‌و ژمارەیە ( بڕوانە : ئا. ن. گڤۆزدێڤ ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکـەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکـۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٢٢ ) ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەسیلەیێکـی سـەربەخۆ نین لـە دەربڕینی واتـای لێکسـیکی‌و ڕێزمانی‌دا ، بەڵکـو بەندن بە دۆخو جنس‌و ژمارەی ئەو ناوەوە کە لەگەڵـی هـاتووە ( بڕوانـە : ن. س. ڤالگینـا ، د. ئێ. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ف. ف. تساپکێڤیچ ، زمانی ڕووسـی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٠٢ ــ ٢٠٣ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

پێوەندی بە ناوەوە ئاشکرا دەبێ(٤) .
ئەگەرچی ئاوەڵناو دۆخو جنسو ژمارەی نی‌یە ، بەڵام خاوەنی خاسیەتێکی تایبەتی خۆیەتی ، ئەویش بوونی پلەیە . بەم چەشنە لە لایەنی وشەسازی‌یەوە پێوەندی ناوو ئاوەڵناو لەم شێوەیەدا دەردەکەوێ : لە سەرێکەوە ناو سێ حاڵەتی هەیە ( دۆخو جنسو ژمارە ) ، کە ئاوەڵناو نی‌یەتی . لە سەرێکی دی‌یەوە ئاوەڵناو خاوەنی حاڵەتێکە ـ ( پلە ) ، کە ناو نی‌یەتی . بەو پێ‌یە بەگشتی ئاوەڵناوو ناو لە چوار لایەنەوە لەیەك جیادەبنەوە. جا لە ڕێگای ئەو چوار حاڵەتەوە دەشێ بە ڕوونی ناوو ئاوەڵناو لەیەکتر جوێ‌بکرێنەوە(٥) .
ئەگەرچی لە زمانی کوردیدا دەلوێ لە ڕێگای ئەو چوار حاڵەتە بنەڕەتی‌یەوە ناوو ئاوەڵناو جیابکرێنەوە ، بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە لە هەندێ ڕووی دی‌یەوە ئاوەڵناو تایبەتێتی وای هەیە ، ناو نی‌یەتی . یاخود بەپێچەوانەوە تایبەتێتی ئەوتۆ لە ناودا هەیە ، کە لە ئاوەڵناودا نی‌یە . وەك :
هەرچەندە گەلێ پێشگرو پاشگر هەنو وەك یەك دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادەو دەیانکەنە ناوی داڕێژراو یان ئاوەڵناوی داڕێژراو ، بەڵام هەندێ پێشگرو پاشگر هەن ، کە هەر ناو ڕۆدەنێنو ئاوەڵناو سازناکەن ، یاخود بەپێچەوانەوە تەنیا ئاوەڵناو دروستدەکەنو بارمەتیی داڕشتنی ناو نادەن .. هەندێ پێشگرو پاشگر هەن دەچنە سەر

---

( ٤ ) لە زمانی ئاوێستادا ناوو ئاوەڵناو وەك یەك خاوەنی دۆخو جنسو ژمارەنو تەنیا هەندێ فۆرمی جیاوازی جنسو توانای پێکهێنانی پلە ئاوەڵناو لە ناو جیادەکاتەوە . هەردوو بەشە ئاخاوتنی ناوو ئاوەڵناو سێ جنس ( نێر ، مێ ، بێ‌لایەن )و سێ ژمارە ( تاك ، جووت ، کۆ)و هەشت دۆخیان هەیە ( بڕوانە :س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٤٠ ـ ٤٤ ) . لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ئەگەرچی لە فۆرمی دۆخو جنسو ژمارەدا جیاوازی لە نێوان ناوو ئاوەڵناودا زۆرە ، بەڵام ئاوەڵناو خاوەنی دۆخو جنسو ژمارەیە ( بڕوانە : ف . س . ڕاستورگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٥١ ـ ٥٢ ) .
( ٥ ) هەرچەندە پاشبەندو نیشانەی ئیزافە بە ئاوەڵناویشەوە دەلکێن، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێ کە ئاوەڵناو خاوەنی دۆخو جنسو ژمارەیە ، چونکە ئەمە تەنیا دیاردەیێکی ڕواڵەتی‌یەو دەنا لە بنەڕەتدا ئەو نیشانانە نیشانەی ناونو لە هەموو بارێکدا هەر بۆ ناوەکە دەگەڕێنەوە . بەپێچەوانەشەوە، دەبینین هەندێ ناو نیشانەی پلەی بەراورد وەردەگرن، جا ئامەش ئەوە ناگەیەنێ کە ( ـ تر ، ـ ترین ) نیشانەی تایبەتی ئاوەڵناو نەبن .



منتدى إقرأ الثقافي

ناوو ناچنە سەر ئاوەڵناو ، یان بەپێچەوانەوە بە ئاوەڵناوەوە دەلکێن‌و بە ناوەوە نالکێن . نموونە :

پاشگری ( ـ باز ) لەگەڵ ئەوەدا کە یاریدەی ڕۆنانی وشەی « سەرباز » دەدا ، کە ناوی داڕێژراوە ، هەروەها هاریکایی سازکردنی وشەی «فێڵباز»یش دەکا ، کە ئاوەڵناوی داڕێژراوە . . .

پێشگری ( بێ ـ )و پاشگری (ـ ێنە) یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن « بێ‌ویست ، بێ‌خەف . . . » ؛ « نیسکێنە ، زەردێنە . . . »و یاریدەی سازکردنی ئاوەڵناوی داڕێژراو نادەن . . بەپێچەوانەوە پێشگری ( بێ ـ) و پاشگری ( ـن ( — in هاریکایی ڕۆنانی ئاوەڵناوی داڕێژراو دەکەن «بێ‌هۆش ، بێ‌کار . . . » ؛ « ورگن ، تووکن . . . »و لە پێکهێنانی ناوی داڕێژراودا بەشداری ناکەن . . .

پێشگری(بەـ)و پاشگری (ـگەر) دەچنە سەر ناو«بەهێز ،بەجەرگ. .»؛ « ئاسنگەر ، مزگەر . . »و ناچنە سەر ئاوەڵناو . . . بەپێچەوانەوە پاشگری (ـەك) دەچێتە سەر ئاوەڵناو « بەرزەك . . . »و ناچێتە سەر ناو . . .

وێنەیێکی دی لە جیاوازیی ناوو ئاوەڵناودا ئەوەیە ، لەگەڵ ئەوەدا کە ناو دەبێ بە ئاوەڵناوو ئاوەڵناویش دەبێ بە ناو ، بەلام ناو نابێ بە ئاوەڵکردار، هەرچی ئاووەڵناوە بە ئاسانی دەبێ بە ئاوەڵکردار . بەوێنە :

وشەی « جوان » لە ڕستەی « نەسرین کچێکی جوانە » دا ئاوەڵناوە ، چونکە وەسفی ناو دەکا ، بەلام ئەگەر بوترێ : « نەسرین جوان دەڕوا » ، ئەوە وشەی « جوان » دەبێتە ئاوەڵکردار ، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا ــ واتە چۆنیەتیی ڕۆیشتن نیشاندەدا . . . وشەی « مندالانە » لە ڕستەی « دارا ڕەوشتی مندالانەیە »دا ئاوەڵناوە ؛ لە ڕستەی « دارا مندالانە دەجوولێتەوە »دا ئاوەڵکردارە . . هتد .

لە بەراوردکردنی ناوو ئاوەڵناوی ناسادەدا ، ئەوە بەدی دەکرێ ، کە هەر یەك لەو بەشە ئاخاوتنە بەشداری لە ڕۆنانی یەکدی‌دا دەکەن . بەوێنە لە ڕۆنانی ناوی داڕێژراوی « بەرزی . . . گەورەیەتی . . .سپێتی . . . بلندایەتی . . قوولایی . . . چاکە . . . سەوزەلان . . . زەردێنە . . . ڕەشکە . . . پاکانە . . . » دا ئاوەڵناوی « بەرز . . گەورە . . . سپی . . . بلند . . . قووڵ . . . چاك . . . سەوز . . . زەرد . . . ڕەش . . . پاك . . »هاوکاری کردووە . . یان لە سازکردنی ناوی لێکدراوی « مێرگەسوور . . . ڕەشماڵ . . . سەوزەگیا . . . »دا ئاوەڵناوی « سوور . . . ڕەش . . . سەوز . . » بەشدارە . . . بەپێچەوانەشەوە دەبینین لە پێکهێنانی ئاوەڵناوی داڕێژراوی « بێ‌هۆش . . . بەهێز . . . جیهانی . . .



منتدى إقرأ الثقافي

شەرمن .. زێڕین ... کرمێ ... ژنانە ... خێڵەکی ... غەمناك .. شەڕانی ... نازدار ... فێڵباز ... »دا وشەکانی « هۆش ... هێز ... جیهان ... شەرم ... زێڕ .. کرم ... ژن ... خێڵ ، غەم ،شەڕ ... ناز ... فێڵ .. » ، کە ناون هاریکارن .. یاخود لە دروستبوونی ئاوەڵناوی لێکدراوی « دڵڕەق ... خۆشباوەڕ .. پیرەمێرد ... »دا وشەکانی « دڵ ... باوەڕ .. مێرد .. » کە ناون بەشدارن .. هتد .

جیاوازیی ئەو دوو بەشە ئاخاوتنە ــ ناوو ئاوەڵناو ــ شتێکی بنەڕەتییە. ئاوەڵناو بەپێی سروشتی سەربەخۆیی تەواوی نییەو هەمیشە مەبەستی ناو نیشاندەدا ، کە لەگەڵیدا هەڤاڵە . ئاوەڵناو خۆی ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری‌ناکا ، بەڵکو چۆنیەتیو خاسیەتو نیشانەیان ڕادەگەیەنێ / بە واتایێکی دیکە ــ دەتوانین بڵێین واتای ڕاگەیاندنی چۆنیەتیو خاسیەتو نیشانەی ئاوەڵناو ، پەیوەندە بە ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێکەوە ــ واتە چۆنیەتیو خاسیەتو نیشانە لە مەودای ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێکدا . لە ئاوەڵناودا هەمیشە خەیاڵ لەبارەی گیانداری یان بێگیانی یان بیر یان کارەوە هەیە . جا ئەمەیە کە یارمەتی ئەوە دەدا بە ئاسانیو بە ڕەوانی ئاوەڵناو بەبێ ناو بەکاربهێنرێ . بەوێنە ، کە دەترێ « قەڵەمێکم بدەرێ ! ئەوە نا ، سەوزەکە » ، دیارەمەبەست« قەڵەمی سەوز»ە . ئاوەڵناوی « سەوز » واتای شتێکی ( سەوز ) دەگەیەنێ . خاوەنی ئەو خاسیەتە لە سەرپاکی ڕستەکەدا ئاشکرا دەبێ . خۆ ئەگەر نیشانەکە ــ ( سەوز ) ، بەبێ پێوەندی خاوەنەکەی ــ ( قەڵەم ) بوترایە ، ئەوە هیچ ئاشکرا نەدەبوو .

ئەو جێناوانەی ئیشارەت بۆ ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دەکەن ، هەمیشە دەچنە ڕیزی دواوە ، چونکە ناوەکە ــ خاوەنی خاسیەتەکە ــ پتر ماناو مەبەستی وتراوەکەی هەڵگرتووە . ناو بە ئاوەڵناو بووە بە دیارخراو ــ « قەڵەمی سەوز » . ئەگەر ناو لە ئارادا نەبێ، ئاوەڵناوەکە جێناوی نیشانەکە دەردەخا ( هەروەك نموونەکەی سەرەوە «ئەوە نا » ) .

لەگەڵ ئەوەشدا . کە لە واتای ئاوەڵناودا هەمیشە نیشاندانی خاسیەتی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك هەیە ، لە هەندێ باریشدا بە یارمەتیی نیشانەی دیاری‌کراوەوە دەتوانێ جێگەی ناوبگرێتەوە .

جیاوازی لە نێوان بەکارهێنانی ئاوەڵناو بەبێ ناو لەگەڵ بوونی ئاوەڵناو بە ناودا هەیە . بەوێنە :

١ ــ قەڵەمێکی چۆنت کری ؟
ــ سەوز .

لێرەدا ئاوەڵناو ــ « سەوز » بەبێ ناو ــ « قەڵەم » بەکارهاتووە .

٢ ــ نەخۆشێکی زۆر بێهۆش لە تەنیشتمەوە پاڵکەوتووە .

« نەخۆش » ، کە لە بنەڕەتدا ئاوەڵناوە ، لێرەدا بووە بە ناو .

لە زمانی کوردیدا گوێزانەوەی ئاوەڵناو بۆ ناو ئەو خاسیەتەی هەیە ، کە وا ئاوەڵناوە گوێزراوەکە دەبێ بە کۆڵەکە بۆ دیارخەرەکانی دی . بەوێنە : « ئەو نەخۆشانە » ؛ « نەخۆشەکانی دوێنێ » ؛ « نەخۆشێکی بێهۆش » .. هتد .

پرۆتسێسی پێچەوانە ــ ڕوودانی بوونی ناوە بە ئاوەڵناو . ئەمە لە سروشتدا کەمتر واقیعییە ، وەك لە بوونی ئاوەڵناو بە ناو . ناو ئەگەرچی بە هۆی کەرەستەی وشەڕۆنانەوە بە ئاسانی دەبێت بە ئاوەڵناو ، بەڵام ئەگەر لەو ڕێگەیەوە نەبێ ، ئەوە بارو دۆخێکی تایبەتی دەوێ کە ئەو دەورە ببینێ .

هەموو ئەوەی لە سەرەوە باس کراوە ، ئەوە نیشاندەدا ، کە لە زمانی کوردیدا ناوو ئاوەڵناو دوو بەشە ئاخاوتنی جیاو سەربەخۆنو هەر یەکەیان خاوەنی تایبەتێتیو خاسیەتی خودی خۆیانن .

## ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە

خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاری دەکا یان ڕاستەوخۆ لە سەر بناغەی واتای لێکسیکی ( سەوز ، سپی ، لەڕ ، چالاك ... ) یان لە ڕێگای پێوەندی شت بە شتی دیەوە ( چیای بەفرین ، زمانی کوردی ... ) ڕادەگەیەنرێ .

لە ئاسۆی ئەو پێوەندییەوە کە ئاوەڵناو چۆنو کام خاسیەت نیشاندەدا سەرپاکی ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا دابەش دەبێ بەسەر ئەم جۆرانەدا :

### ١ ــ ئاوەڵناوی چۆنێتی .

ئاوەڵناوی چۆنێتی ئەو ئاوەڵناوەیە ، کە وا ڕاستەوخۆ واتای چۆنێتیو خاسیەتو نیشانە ڕادەگەیەنێ . واتای لێکسیکیی ئاوەڵناوی چۆنێتی هەمەجۆرە : ڕەنگ نیشاندەدەن ( سپی ، سوور ، سەوز ، ئاڵ ، ڕەش ... ) ؛ خاسیەت ڕادەگەیەنن ( ترش ، سوێر ، گەرم ، قورس ، پتەو ... ) ؛ جۆری سیفەت دەردەبڕن ( ڕەزیل ، ڕووخۆش .. ) ؛ شێوەی مرۆڤو گیانلەبەر دەخەنە پێشچاو ( خڕ ، قەڵەو ، لاواز ، ڕووت ... ) ؛ چەمکی دەوروبەر دەردەبڕن ( ڕاست ، چەپ ، پان ... )و هەندێکی دی .

ئاوەڵناوی چۆنێتی خاوەنی ئەو تایبەتییە لێکسیکیو ڕێزمانییانەی خوارەوەیە :

١ ــ توانای پێکهێنانی پلەی بەراوردو پلەی باڵای هەیە ، وەك :

گران ــ گرانتر ــ گرانترین

قەڵەو ــ قەڵەوتر ــ قەڵەوترین



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ــ دەشێ سادە یان دارێژراو یان لێکدراو بێ . وەك :
ا ــ سادە . وەك :
جوان ، ڕەش ، لەڕ ، سوور ، ترش ...
ب ــ دارێژراو :
★ بە یارمەتیی پێشگر . وەك :
بێهۆش ، بەهێز ، نەخۆش ، ناخۆش ...
★ بە یارمەتیی پاشگر . وەك :
دانا ، زانا ، لەرزۆك ، نازدار ، فێڵبار ، نەرمۆڵە ، پیسۆکە ...
ج ــ لێکدراو . وەك :
باڵاعەرعەر ، ڕووڕەش ، خۆشباوەڕ ، پیرەمێرد ...
٣ ــ دەلوێ زوربەی ئاوەڵناوی چۆنێتی وەك ئاوەڵکردار بەکاربهێنرێ . بۆنموونە :
زۆر ، کەم

**... کاروانچیەکان زۆریان وتو ئەوان کەمیان بیست .**

( لە خەوما ، ل ٣٣ )

گورجوگۆڵ

**هاتوچۆیانە بە گورجوگۆڵی**
**بەڵام پێکنایە ئیش بۆ کلۆڵی :**

( گۆران ، ل ١٣٦ )

٤ ــ بەشێکی زۆریان دەتوانن ببنە ناوی تایبەتیو نازناو . وەك :

شیرین ، نازدار ... بێکەس ، پیرەمێرد ...

**قەدی گوڵو دەمی گوڵ ئەمەی کە قووتی جانە**
**لە باغی یاسەمیندا شکۆفەیی گوڵانە**
**بەهاری بێخەزانە ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

( وەفایی ، ل ١٩٥ )

**بێکەس بوو وەك پاڵەوان**
**پەنجەیْ لە چاوی چەقان**

( گۆران ، ل ٨٤ )

٥ ــ بەشێکی کەمی ئاوەڵناوی چۆنێتی دەتوانێ دەوری ناو ببینێ.وەك:
نازداری جافان / نازدارانی جاف ،
گەورەی کورد ، جوانی لادێ ، زانای بەناوبانگ ...

**ئای بۆ پەریخان نازداری جافان**
**ئاهووی زەڕباهووی عەنبەر کلافان**

( پیرەمێرد ، ل ١٢٤ )



منتدى إقرأ الثقافي

**بۆچ پێم نانوێنی وێنەی فۆتۆغراف**
**وێنەی شیرینی نازدارانی جاف**

( پیرەمێرد ، ل ١٢٤ )

٦ ـ هەندێ ئاوەڵناوی چۆنێتـــــی دەتوانێ لە یەك کاتدا جێی خۆیو ناوەکەش بگرێ . ئەمیش دوو جۆرە :

أ ـ پێشتر ناوەکە دەوترێو جاری دووەم ناوترێتەوە . بەوێنە لـــە لاپەڕە (٤٧)ی چیرۆکی « لە خەوما »دا باسی « پیاوێکی کوڵەبنە » کـراوە ، بەڵام لە لاپەڕە (٤٨)دا کە باســـی هاتۆتـــەوە ، وشەی « پیاو » کە ناوە ، نەوتراوەتەوەو نووســـراوە : « کوڵەبنەکە کە لای خـــوارەوە وەستابوو ، ئەویش هەڵیدایە ... » .

ب ـ ئەگەرچی ناوەکە لە هیچ شوێنێکدا نەوتراوە ، بەڵام لە ناوەرۆکدا هەیە . وەك :

**گەورە ئاو ئەڕێژێو بچووك پێی تێ‌ئەخا**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٧٧ )

**گەورە قەدری خۆی بە خۆیەوەیە**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٨٨ )

**« عەیبە .. عەیبە ... » ئەی ڕەفیان ماڵی خەڵك وێران‌ئەکـــا**
**پیاو ئەخاتە سواڵو سووکی ، گەورە سەرگەردان ئەکا**

( بێ‌کەس ، ل ٨٨ )

لە ناوەرۆکدا دیارە ، مەبەست لە « گەورە »و « بچووك » پیاوی گەورەو مرۆڤی گەورە ... پیاوی بچووك ، مرۆڤی بچووك ... ە .

... هتد .

ڕوونکردنەوەی تایبەتێتی لێکسیکـیو ڕێزمانیی ئاوەڵنـــاوی چۆنێتی جیاوازی لەگەڵ ئاوەڵناوی نیـــسبـی نیشان دەدەن . بەڵام وەنەبـێ هەمــوو ئاوەڵناوێکی چۆنێتی تێکرای ئەو تایبەتێتی‌یانەی تێدابێ ، کە لێیان‌دواین . هۆی ئەو جیاوازی‌یەش بەندە بە کاتو سەردەمی پەیدابوونی ئەو ئاوەڵناوە لە زماندا یان بەندە بە واتاو پێکهاتنی ڕێزمانیو شێوازی بەکارهێنانی‌یەوە .

ئەو ئاوەڵناوی چۆنێتی‌یانەی ، کە دەلالەت لـــە شتێك دەکەنو زۆریو کەمی‌یان نی‌یە ، پلەی بەراورد پێك‌ناهێنن . وەك : کوێـــر ، شــــــەل ... ئەگەرچی هەندێکیان بە ئاشکرا نیشانەی ( تر ، ترین ) وەردەگرن ، بەڵام لـــە ڕووی مەنتیقەوە « کوێر » هەر « کوێر »ە وئیدی « کوێرتـــر ، کوێرترین » زیادە .

بەم چەشنە ئەو تایبەتێتی‌یە لێکسیکیو ڕێزمانی‌یانەی ئاوەڵنـــــاوی چۆنێتی ، کە نیشانمان‌دان تا ڕادەیێك گشتینو دەتوانن ببنە بەڵگە بــــــۆ جیاکردنەوەی ئاوەڵناوی چۆنێتی لە ئاوەڵناوی نیسبی .



منتدى إقرأ الثقافي

ئاوەڵناوی چۆنێتی لە ڕووی پێکهاتنـــی فۆنەتیکی‌یەوە لـە هـەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا چەند جۆرێکی هەیە :

١ ـ بەشێکی زۆریان بە تەواوی وێکدەچن و هیچ جیاوازی‌یێك لــــە نێوانیاندا نی‌یە . وەك :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| چاك | چاك |
| باش | باش |
| درێژ | درێژ |
| سپی | سپی |
| ڕەش | ڕەش |
| پیر | پیر |

... هتد .

٢ ـ هەندێکیان جیاوازی لە نێوان بەشێك لە فۆنێمەکانیاندا هەیـــەر بەڵام خاوەنی یەك ڕەگن . بۆ نموونە :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| تاڵ | تێل |
| سوور | سۆر |
| هەرزان | ئەرزان |
| وشك | هشك |
| هەژار | ژار |
| سارد | سارد |
| زەرد | زەر |
| نوێ | نوو |
| کوێر | کۆر |

... هتد .

٣ ـ دەستەیەکیان خاوەنی ڕەگی جیاوازن . بەوێنە :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| هەژار | بەلەنگاز ، کەسیب |
| ئازار | عەگید ، فێرز ، جندی |



منتدى إقرأ الثقافي

| | |
|---|---|
| جوان | بەدەو |
| چاك | قەنج |
| شەل | تۆپاڵ |
| شێت | دین |
| ڕێكوپێك | قولای |

هتد . (٦)

## ٢ ـ ئاوەڵناوی نیسبی .

ئاوەڵناوی نیسبی ئەو جۆرە ئاوەڵناوەیە ، كە وا ڕاستەوخۆ دەلالەتی شتێك ڕاناگەیەنێ ، بەڵكو لە ڕێگای پێوەندیەوە بە شتیدیەوە واتا دەدات ـ واتە بە هۆی پێوەندی بە دیاردەیەكەوە یان ڕووداوێكەوە دەردەكەوێ.

جیاوازیی دیاری مۆرفۆلۆژی نێوان ئاوەڵناوی چۆنێتیو ئاوەڵناوی نیسبی لە زمانی كوردیدا ئەوەیە ، كە ئاوەڵناوی نیسبی لە ڕووی پێكهاتنەوە تێكڕا ناسادەیە ، هەرچی ئاوەڵناوی چۆنێتییە بە زۆری سادەیە ... لە زمانی كوردیدا هەندێ پاشگرو پێشگر هەن یارمەتیی ڕۆنانی ئاوەڵناوی نیسبی دەدەن ، كە لە ناویاندا هەندێ پاشگر ، وەك (ـی ، ـین ...)؛ (ـانە ، ـەكی، ـە ... ) پتر دیارو چالاكن .

چەند نموونەیێك :

( ـی ) :

كوردی ، كرمانجی ، عێراقی ، كێوی ، پۆلایی ، شیری ، زستانی ...

( ـین ) :

زێڕین ، ئاسنین ، بەردین ، پۆلایین ، دارین ...

( ـانە ) :

پیاوانە ، ژنانە ، ئازایانە ، مەردانە ...

( ـەكی ) :

دەشتەكی ، خێڵەكی ...

( ـە ) :

بەهارە ، زستانە ، هاوینە ...

... هتد .

---

( ٦ ) شایانی باسە ، مامۆستا قەناتی كوردۆ باسی ئەو بەراوردەی دیالێكتی ژووروو و خواروی كردووە ( بڕوانە : ق. كوردۆییف ، دەستووری زمانی كوردی ـ بە كەرەستەی دیالێكتی كرمانجیی ژووروو و خواروو ، مۆسكۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٧٨ ـ ٨٠ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

مانای گشتیی لێکسیکی ئاوەڵناوی نیسبی ناگۆڕێو دەشێ وەك « پێوەندی بەرانبەر شتێك » یان « خاسیەت بۆ شتێك » دیاری بکرێ . ئەم بارودۆخە یارمەتی گۆڕینی ئاوەڵناوی نیسبی دەدا بە ناو ــ واتە ئەو ناوەی ئاوەڵناوەکەی لێ دروستکراوە . بەوێنە :

**قاپی زێڕین ــ قاپی زێڕ**
**گوڵی بەهارە ــ گوڵی بەهار**
**... هتد .**

لە زمانی کوردیدا هەر ناوێك تاك بێ یان کۆ ، ئەگەر لە دۆخی ئیزافەدا دەوری دیارخەری ببینێ ، ئەوە ئەرکی ئاوەڵناوی نیسبی بەجێدێنێو دەتوانێ واتای پێوەندی بە کەسێکەوە نیشانبدا « شیری دایك ، باغچەی منداڵان ... » ؛ مانای پێوەندی بە ڕووداوێکەوە دەبڕێ « داسی دروێنە ، دەرزی دروومان ... » ؛ پێوەندی بە کاتو شوێنەوە ڕادەگەیەنێ « بارانی بەهار،ڕەشەبای هاوین ، چیای کوردستان ، ڕێگای کوێستان... »؛ پێوەندی بە واتای تەجریدەوە دەخاتە بەرچاو « دوکانی هەلاجی ، هێزی برایەتی ... » ... هتد .

لە زۆر زماندا ئاوەڵناوی نیسبی ، وەك دەستوور پلەی بەراوردو پلەی باڵای لێ پەیدا نابێو نابێتە ئاوەڵکردار (٧) .

لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ئاوەڵناوی چۆنێتیو نیسبی دوو کۆمەڵی تەواو لەیەکتر دابڕاو نینو سنووری ڕێزمانی لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت ، لەبەر ئەوەی خاسیەتی سیمانتیکی ڕێگە بە جیاکردنەوەی گروپێك لە گروپێکی دی دەداو مەودای گۆڕان پەیدا دەبێ .

لە واتای زوربەی ئاوەڵناوی نیسبیدا ڕەنگی چۆنیەتی هەیە ، کە وا لە ئەنجامی هەندێ هۆی دیاریکراودا ، گەشەدەکا بۆ بوون بە واتایێکی سەربەخۆ . بۆ نموونە : ئاوەڵناوی نیسبی « ئاسنین ، ژنانە ... و گەلێکی دی » چۆن دەتوانرێ بە واتای بنەڕەتیی خۆی ، کە ئاوەڵناوی نیسبییە بەکاربهێنرێ : « ڕێگای ئاسنین ، جلی ژنانە ... »، هەروەها بەو چەشنە دەشێ بە واتای ئاوەڵناوی چۆنێتییش بەکاربهێنرێ : « سەری ئاسنین ؛ ڕەوشتی ژنانە ... » .

ئاوەڵناوی نیسبی کە دەبێتە ئاوەڵناوی چۆنێتی ، هەندێ جار خاسیەتی مۆرفۆلۆژی ئاوەڵناوی چۆنێتی وەردەگرێ . بەوێنە کەمێکیان دەتوانن

---

(٧) بڕوانە : ن. س. ڤالگینا ، د. ێ. ڕۆزێنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ف. ف . تساپکێڤیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ١٩٧ ــ ٢٠٠ .



منتدى إقرأ الثقافي

نیشانەی پلەی بەراوردو پلـەی بـالآ وەربگرن‌و پچێکیشـیان دەشێ ببنـە ئاوەڵکردار .

هەندێ ئاوەڵناوی نیسبی لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی بـە واتـای ئاوەڵنـاوی چۆنێتـی ، واتـای زووی ونەدەکـاو دێتـە ڕیزی ئاوەڵنـاوی چۆنێتی‌یەوە .

### ٣ ــ ئاوەڵناوی نادیار (٨) .

ئاوەڵناوی نادیار ئەو جـۆرە ئاوەڵنـاوەیە ، کە وا دەلالەت لەسـە، شتێکی دیاری‌کراو ناکاو واتای کەوتووەتە چوارچێوەی عەهدێکەوە .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ئاوەڵناوی نادیار هەیە .

یەك ــ ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە . وەك :

تر ، کە ، دی ، دیکە ، دن ...

ئەم کۆمەڵـە وشەیە ، کە تێکـڕایان واتـای ( other ) ی ئینگلیزی‌و ( اخر )ی عەرەبی دەگـەیەنن ،ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوەن‌و بەتایبەتی لە دۆخی ئیزافەدا دەبینرێن‌و دەوری دیارخـەر دەبینـن‌و بە دوا دیارخراودا دێن . دەشێ سەرپاکیان لە ڕستەدا لە جێی یەکتر بەکاربهێنرێن‌و بە یەکدی بگۆڕدرێنەوە .

**ئاوەڵناوی ( تر ) :**

ئاوەڵناوی ( تر ) تەنیـا لە ناوچەی سلێمانی‌و کـەمێ بەشە دیالێکیتی کرمانجیی خوارووودا بەکاردێنرێ .

---

( ٨ ) چ نووسەرانی ڕێزمانی کوردی یەکێتی سۆڤێت‌و چ ئەوانـی ئەورووپا بە هیچ چەشنێك بەلای ئاوەڵناوی نادیاردا نەچوون . لای خۆشمان تەنیا چەند زمانەوانێك لەو باسە دواون‌و زوربەی زۆری نووسەران بەلایـدا نەچوون . ئەو مامۆستایانەش ، کە باسیان لێوەکردووە وشەی هەمەجـۆرو بەشە ئاخاوتنی جۆربەجۆریان بە ئاوەڵناوی نادیار داناوە . بەوێنە مامۆستا تۆفیق وەهبی لەپاڵ وشەکانی « تر ، کە » ؛ « وا ، وەها »دا هەروەهـا « هەندێ ، گەلێ ، فلان ، کام ، هیچ ، هەموو ، هەر ، چەند ، چی ، هەرکام، هەرچی ، هەرچۆن ، زۆر ، کەم ... »یشی بە ئاوەڵناوی نادیار لە قـەڵەم داوە ( دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یە کەم ، بەغـدا ، ١٩٢٩ ، ل ٧٨ ــ٨٠). مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش وێڕای « تر ، کە ، دی ، دیکە » ، « وا ، وەها » ، ئەمانەشی « ێ ، ێك ، یـەك » ؛ « وەکـو ، هەروەکـو » ؛ « هەندێ ، تۆزێ ، برێ ، کەمێ ، پێچێ ، چۆڕێ » ؛ « هیچ » ؛ « گەلێ » ؛ « گشت » ؛ « هەر ؛ « نە » ، « زۆر ، فرە » ؛ « کەم » هەر بە ئاوەڵنـاوی نادیار داناوە ( ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٢ ــ ١٢٦ ؛ ١٣٢ ــ ١٣٣) ... هتد .



منتدى إقرأ الثقافي

چەند نموونەیێك :

**تا ئەسیری داوی تۆم ڕەحمێ بە حاڵم کە تو خوا**
**مودەیێکی تر لە دەستت ڕادەبوورم دەرفەتە**

( کوردی ، ل ٦٧ )

**هەر ئەوەندەم زانی یەکێکی تریان لە پشتەوە زرموهوڕ دامیە بەر پێلەقە ... ئەوی تریشیان لێم هاتە پێشەوە بە پاڵەپەستۆ بە هەرسێکیان دایانگرتم ...**

( لە خەوما ، ل ٣٨ )

**با ڕەنگیان پەرداخت بێو جێگەیان سەرچڵ بێ ،**
**بە واتەی خەڵکی تر با ناویان شاگوڵ بێ**

( گۆران ، ل ٤٥ )

**دەزگاو دوکانی شارەکان دادەنرێ**
**ئەمیان دەفرۆشیت ئەوی تر دەکری**

( کۆیی ، ل ٣٠ )

... هتد (٩) .

---

( ٩ ) لە زمانی کوردیدا دوو مۆرفێمی هاوبێژی ( تر ) هەیە . یەکێکیان ئاوەڵناوی ( تر )ە . کە لەسەرەوە باسمانکرد . ئەوی دیيان نیشانەی پلەی بەراوردی (ـ تر)ە ، کە دواتر لە باسی ( پلەکانی ئاوەڵناو )دا لێیدواوین ( بڕوانە : ل ٩٩ـ١٠٨ ) .

لە نووسینی کوردیدا زۆر جار ئەوە دێتە بەرچاو کە هەردوو مۆرفێمی ( تر ) بە کۆتایی وشەوە دەلکێنرێن . جا ئەو دوو مۆرفێمە ، کە یەکەمیان بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆیەو دووەمیان نیشانەیە ، ڕاست نییە وەك یەك تەماشابکرێنو بنووسرێن . ( تر )ی ئاوەڵناو دەبێ سەربەخۆ بنووسرێو (ـ تر)ی نیشانە پێویستە بە وشەی پێش خۆیەوە بلکێنرێ ، چونکە ڕاستوایە بەشەکانی ئاخاوتن وشەی تەواو بن یا ناتەواو دەبێ بەجیا بنووسرێن ، بەڵام نیشانەو پێشگرو پاشگر کە بوونی سەربەخۆیان نییە پێویستە بە وشەوە بلکێنرێن ( بۆ زانستی زیاتر لەبارەی نووسینی ئەو دوو مۆرفێمەوە ، بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، بەغدا، ١٩٨٦ ، ل ١٣٥ ـ ١٣٦ ) .

بۆ زمانی ئەدەبو نووسینیش پەسەند وایە ( تر ) هەر بۆ پلەی بەراورد بێو لە حاڵەتی ئاوەڵناویدا ( دی ، دیکە .. ) لەجێی بەکاربێنرێ ( دەربارەی ئەو ڕایە ، بڕوانە : ڕەئووفی ئەحمەدی ئالانی ، دیاردەیەکی زمانەوانی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، خولی دووەم ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٦ ـ ٤١ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

**ئاوەڵناوی ( کە ) :**

ئاوەڵناوی ( کە ) کورتکراوەی ( دیکە = دی + کە ) یەو هەر لە ناوچەی سلێمانیو چەند شوێنێکی کەمی دی بەرچاو دەکەوێ . ئەگەرچی هەنـــدێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەو ڕایـەدان ، کە ئاوەڵنـــاوی ( کــە ) تازە پەیدابووەو کــەم بەکاردێنــرێ ، بەڵام کەرەستــەی بەردەست ئەو ڕایــە ڕەتدەکاتەوە . ئەوەتە لە خوێندنــەوەی سەرپــاکی شیعرەکانــی نالیدا ، گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە نالی لە شیعرەکانیدا نەك هەر ( کە )ی زۆر وتــووە، بەڵکو لە ( تر ) و ( دی ) و ( دیکە ) ... شی زیاتر بەکارهێناوە .

بە نموونە :

**حۆری ئەوا بە مونتەظیری دێتە مەنظەرە**
**لایێکی کەشی لە جەننەتو ڕیضوان تەدارەکە**

( نالــی ، ل ٤٤٢ )

**هەر دەمە فەرشی کەسێکی کەیە بێ مەهرو نیکاح**
**دوورە لە چاکانی ، عەجەب فاحیشە دنیایێکە !**

( نالی ، ل ٤٦٣ )

... هتد .(١٠)

**ئاوەڵناوی ( دی ) :**

( دی ) کورتکراوەی ( دیکە )یە . هەرچەندە نووسەران ڕاستن لەوەدا، کە ئەم وشەیەیان داوەتە شێوەی موکری ، بەڵام دەبێ ئەوەش لەیادنەکەیــن، کە لە زوربەی دیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا بەکاردێنرێ .

---

( ١٠ ) لێرەدا باسی (کە)مان تەنیا وەك ئاوەڵناوی نادیار کردووە ، واتە ــ ئەوەی

( ١٠ ) لێرەدا باسی (کە) تەنیا وەك ئاوەڵناوی نادیار کردووە ، واتە ــ ئەوەی مەبەستی لێکۆڵینەوەکەمانە . جا ئەوەش دێنینەوە یاد ، کە لە زمانــی کوردیدا ئەم ( کە )یە وەك ئامرازی مەرجو ئامرازی پێوەندیو...زۆر بەکاردێنرێ . تەنانەت هەندێ نووسەریش بەهەڵە وەك ( جێنـــــاوی لێکدەر ) تەماشایانکردووە ( بۆ زانیاری تەواو لەبارەی ئەرکو دەوری « کە »وە ، بڕوانە :

أ ــ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمــــانو زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٦٢ ــ ٢٦٣ .

ب ــ محەمەد ئەمین هەورامانی ، « کە » لە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردیدا ، گۆڤاری « کــاروان » ، ژ ١٢ ، ئەیلــوولی ١٩٨٣، ل ١٩ ــ ٢٨ .

جـ ــ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ٢٨٨ ــ ٢٩٠ .

...و هەندێکی دی ) .



منتدى إقرأ الثقافي

چەند نموونەیێك :

**خۆنکار جوابی نووسیوە : « مانگێکی دی لەشکری دەگاتێ » .**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ١٨١ )

**ئەوی دی نازانم چی‌یە ...**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٧٢ )

**برایم لەگەن میرحەجی بەجێ‌ما ، هەتتا ساڵێکی دی ؛ زستانیان بە سەردا هات .**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٧٣ )

**ڕەقیب و موددەعی هەردوو لە خەودان**
**هەتا چەن ساعەتێکی دی نەما باس**

( نالی ، ل ٢٣٣ )

**... شەڤا دی ڕەنگەکی دی جلکا لبەر خوە کرو خولێكداو چوو سەر بالی ...**

( خالید حسەین ، ل ٢٦ )

**جارەکا دی ژن باب بگری ڤە هاتە خواریێ و چۆ نك مێرێ خوە ...**

( خالید حسەین ، ل ٢٧ )

... هتد .

**ئاوەڵناوی ( دیکە ) :**

( دیکە ) کە لە زمانی فارسیدا لە شێوەی ( دیگر )دا دەبینری(١١) ، هەر لە شێوەی موکریان و چەند شوێنێکی کەمی دیدا بەکاردەبرێ .

چەند نموونەیێك :

**... کابرا زۆر مات بوو ، هیچ کاسبی دیکەی نەدەزانی ...**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ١٨٧ )

**لە لایەکی تەکیەیە ، لە تەرەفی دیکەیان خانەقا ڕۆنانە**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٠١ )

**لە لایەکی دە ملێی شەکرو شەربەتو ، لە لای دیکە نوغڵ و نەباتی**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٧٦ )

... هتد .

**ئاوەڵناوی ( دن ) :**

ئاوەڵناوی ( دن ) لە هەندێ بەشە دیالێکتی ژووروودا(١٢)و بەتایبەتی

---

( ١١ ) بڕوانە : ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی تهران ١٣٤٣ ، ل ٣١ .

( ١٢) بڕوانە : گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد، هەولێر ، ١٩٦١، ل.٢٨٠.



منتدى إقرأ الثقافي

له زمانی کوردەکانی سۆڤیەتدا له کاردایه . وەك :

**پادشا گۆت : « حەلالیو ڕاستگۆیی‌یا ته عەیان بوو ، ته خوەستت قەنجی‌یێ بکی ، ای تشتەکی دن قەومی ، گونێ ته تونه ، ئەز نکارم ته بکوژم ... »**

( کوردۆ ، ل ٤٠ )

... هتد .

وێڕای « تر ، کە ، دی ، دیکە ، دن » لە هەندێ شێوەی کوردیدا وشەی دی بەرچاو دەکەوێ . بەوێنە لە شێوەی زازادا « بین » بەکاردێنرێ(١٣) ...

بەشێکی زۆری ئەم ئاوەڵناوانە لە بەراییەوە ( ئی ) یاخود (یەك)...یان دەچێتەسەر .

١ ــ لەگەڵ ( ئی )دا . وەك :

ئیتر ، ئیکە ، ئیدیکە ، ئیدن (١٤)

چەند نموونەیێك :

**سبەینێ وەرنە سەیری کوشتنم وادەم چەها داوە**
**لەسەر وادەی درۆی ئەو نادەم ئیتر وادە ، قەت نادەم**

( مەحوی ، ل ٢٢٨ )

**عەقیم ئاسا لە زگ وەستایەوە حەملی نەما ئیتر**
**لە پاش تۆ دایەیی دونیا بە مثلی مادەری عیسا**

( سالم ، ل ٢٧ )

**بانگم وەبەر خوای گەورە**
**ئیدی غەوسی بەغدایێ**
**لانکت لە بۆ دەکەم**
**لە داری دار خورمایێ**

( فۆلکلۆر ، ل ١٠٣ )

---

( ١٣ ) مالمیسانیژ ، فەرهەنگێ دملکی ــ ترکی ، ئۆساك ، ١٩٨٧ ، ل ٤٨ .

( ١٤ ) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا زۆر جار ( ئێ ) لەبریتی ( ئی ) دەوترێ . وەك :

**چین چین کرن زولفێن سیا کەسك ئەطلەسا دیبا قەبا**
**ئێدی نشان نابن خویا تێکل‌کرن لازم صەبا**

( جزیری ، ل ٩٤ )

**پەریێ گوت : نەترسە ئەز ئێدی تێهنی نابم ...**

( خالید حسەین ، ل ٦٨ )



منتدى إقرأ الثقافي

**دڵو دین هەرچی بوو قوربانی تۆ بوو**
**هەتا کەی ئیدی ئەم نازو عیشابە ؟**
( وەفایی ، ل ١١٥ )

**دوور لە تۆ ئیدی مەپرسە ، قوربان**
**حاڵی « نالی » کە نە مردو نە ژیا**
( نالی ، ل ١٢٨ )

**لاس وەرە دوو ماچانت بدەمێ ، یەك لە باتی زەکاتێ ، ئیدیکە لە باتـی کەلیمەی شادەتو ئیمانێ .**
( تحفهء مظفریه ، ب١ ، ل ٢٤٢ )

... هتد .

ب ــ لەگەڵ ( یەك )دا . وەك :
یەکتر ، یەکدی ...
چەند نموونەیێك :

**بێ ئەگەر دەستی یەکتری بگرن**
**وەك سکەندەر جیهان هەموو دەگرن**
( کۆیی ، ل ٢٠ )

**من گریە ، ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین**
**من لەعلی بەدەخشانو ، ئەتۆ لوئلوئی لالا**
( نالی ، ل ١١٥ )

**بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین**
**شادبن بە وەصلی یەکدی : کە تۆ طاهیر ، ئەو طەهوور**
( نالی ، ل ١٧٨ )

دوو ــ ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن . وەك :
وا ، ئاوا
وەها ، ئاوەها ، وەهە
ئەوها ، ئاوها
وەسا ، وسا ، وسان

ئەم چەند وشەیە ، کە سەرپاکیان بە مانای ( Such ) ی ئینگلیزی دێن ، ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن(١٥)و هەروەك « تر ، کە ، دی ، دیکە ،

---

( ١٥ ) وشەکانی « وا ، ئاوا ، وەها ... » ، کە لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردنن لە زمانی ڕووسیدا جێناونو لە زمانی ئینگلیزیشدا ئەگەر بە واتای ( Such ) بێت ئاوەڵناوە ، بەڵام کە مانـــــای ( thus, so ) دەدات دەبێتە ئاوەڵکردار . ئەمەش ئەوە نیشاندەدا کە ئەگەرچی ڕێزمانی گشتی هەیە ، بەڵام هەر زمانەش خاوەنی ڕێزمانو تایبەتێتی خۆیەتی



منتدى إقرأ الثقافي

دن ... » بە زۆری لە دۆخی ئیزافەدا دەبینرێن‌و دەوری دیارخەر دەبینن‌و بەدوا دیارخراودا دین . دەلوێ تێکرایان لەجێی یەکتر بەکاربهێنرێن‌و بە یەکدی بگۆردرێنەوە .

( وا )و ( ئەوها ) لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا — واتە لە کرمانجیی ژووروو وخوارووا — بەکاردێنرێن .

( وەها )و ( ئاوەها ) و ( ئاوها ) هەر لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا لە کاردایە .

( وەهە )و ( وەسا )و ( وسا )و ( وسان )یش سەر بە دیالێکتی کرمانجیی ژوورون .

چەند نموونەیێك :

**لە خۆمەوە ... دەستم‌کرد بە قاقـای پێکەنین ، پێکەنینێکی وا کە لەودیوەوە هەموو ڕاچڵەکین ...**

( لە خەوما ، ل ٧١ — ٧٢ )

**پیاوێ بوو نەما ، زۆر تەواو پیاو بوو**
**خاوەن کردارو مەوقیعو ناو بوو**
**پیاوی وا نامرێ ، دیارە ئەمێنێ**
**لە ناو عالەما بەرزو ناسراو بوو**

( بێ‌کەس ، ل ١٤٣ )

**... قسێکی وا پەیدابوو لە مەنزڵی کاکم (١٦) .**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٢٨٧ )

**بە نووری بادە کەشفی ظولەمەتی تەقوا نەکەم ، چبکەم !**
**بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم ، چبکەم !**

( مەحوی ، ل ٢٣٠ )

هتد (١٧) .

---

( ١٦ ) لە ناوچەی موکریان ڕێژەی « وەها کوڕێك ؛ وەها پیاوێك ... » بەکاردێنرێ . ئەمە ڕەنگە تەئسیری زمانی فارسی بێ ، کە دەڵێن « چونین جەوانی ؛ چونین مەردی ... » .

( ١٧ ) لێرەدا بەپێی مەبەستی لێکۆڵینەوەکەمان ، تەنیا ڕووی ئاوەڵناوێتی وشەکانی « وا ، ئاوا ، وەها ، ئاوەها ... »مان خستۆتە پێش‌چاو ، دەنا دەزانین کە بە گەلێ شێوەی دی دەبینرێن . بەوێنە وەك :

أ — ئاوەڵکردار .

لەم بارەدا بە زمانی ئینگلیزی واتای ( thus, so ) دەدات .

نموونە :

# ئاوەڵناو لە ڕووی ڕۆنانەوە

ئاوەڵناوی ناسـاده وەك ناو لـە ڕووی ڕۆنانەوە دابەش دەبێ بەسەر ( داڕێژراو )و لێکدراو)دا

**ئاوەڵناوی داڕێژراو**

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵنـاوی داڕێژراو بە یارمەتیی پێشگرو پـاشگر سازدەبێ . بو ڕۆنانی ئاوەڵناوی داڕێژراو هەندێ پێشگرو پاشگر هـەن ، کە دەچنە سەر ( نـاو یا ئاوەڵنـاو یا کردار یـا ئاوەڵکـردار )ی سادەو دەیانکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

أ ــ ئەو پێشگرو پاشگرانەی دەچنەسەر ناوی سادەر دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو .

یەکەم ــ پێشگر :

لە زمانی کوردیدا دوو پێشـگر هەن دەچنەسەر ناوو ئاوەڵنـــاوی لێدروستدەکەن . وەك :

١ ــ ( بێ ــ ) . وەك :

بێهۆش ، بێکار ، بێگیـان ، بـێهێز ، بێسـنوور ، بـێخەتا ، بێویژدان ،بێئینسـاف ، بێبەش ... بێناف ، بێیار ...(١٨)

---

=

**فەلەك ــ خانەخەرابێ ! ــ بەزمی مەستانی وەها تێکدا**
**نەما داری لەسەر بەردی ، بە دەردی سەر چە ئاواکەم ؟**

( وەفایی ، ل ٧٥ )

ب ــ ئامرازی پێوەندی .

نموونە :

**وا چاکە خەیاڵو ئەسراری هودا بێ**
**نەك بەحثی سورووروو عەلەمو بادی هەوا بێ .**

... هتد . ( نالی ، ل ٦٣٠ )

( ١٨ ) پێشگری (بێ ــ) یاریدەی داڕشتنی ئاوەڵناو لە ناوەوە دەدات‌و واتای نەبوونی جۆرە چۆنێتیی‌و خاسیەتێك ڕادەگەیەنێ . ئەم پێشـگرە زۆر چالاکەو لە هەردوو دیالێکتی سەرکیی کوردیدا بەکاردێنرێ . لـــە زمانیفارسیی ناوەڕاستدا لە شێـــوەی ( ەپێ ــ)دا دەبینرێ ، وەك « ئەپێپیم » ( بێترس ) ؛ « ئەپێگومان » ( بێگومان ) ... ( بڕوانــە : ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦، ل ٣٦)، لە زمانی فارسیی نوێدا لە قالبی (بێ ــ)دایە . لە زمانی پشتۆدا هەر (بێ ــ)یە ، وەك « بێکارە » ... ( بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکوڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤١ ــ ٤٢ ) . لە زمانی ڕووسیشدا ( بێس ــ)ە .



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ــ ( بە ــ ) . وەك :
بەهێز ، بەجەرگ ، بەرێز ، بەتام ، بەپێز ...(١٩)
دووەم ــ پاشگر :
ئەو پاشگرانەی ئاوەڵناو لە ناو سازدەکەن زۆرنین . هەندێ پاشگر هەن چۆن ناو پێكدەهێنن ، هەروەها ئاوەڵناویش دروستدەکەن ، واتە گشتین بۆ ناویش‌و ئاوەڵناویش .
ئەو پاشگرە سەرەکیانەی ئاوەڵناو لە ناو دادەرێژن ، ئەمانەن :
١ ــ ( ــی ) وەك :
جیهانی ، زستانی ، بەهاری ، گەنمی ، نارنجی ، قاوەیی ، پۆلایی ، دینی ، مێژوویی ، هەولێری ، کرمانجی ، کوردی ، ئەڵەمانی ...(٢٠)

---

( ١٩ ) ئەم پێشگرە دەچێتەسەر ناوی سادەو دەیکاتە ئاوەڵناوی دارێژراوو واتای بوونی جۆرە چۆنێتی‌و خاسیەتێك نیشاندەدا . پێشگری (بەــ) دژواتای پێشگری ( بێ ــ) یە . وەك :
بەکار ــ بێ‌کار
بەهێز ــ بێ‌هێز
بەتام ــ بێ‌تام
بەپێز ــ بێ‌پێز
بەهۆش ــ بێ‌هۆش
پێشگری (بە ــ) لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا لە شێوەی (بـ— bi ) دا بەدەردەکەوێ ، وەك : بئینساف ، بهش ... لە هەندێ . بەشە دیالێکتدا ، بەتایبەتی لە ناوچەی موکریان‌و گەرمیانیشدا دەکرێت بە ( وەــ ) ، وەك : وەکار ، وەتام ، وەجەرگ ...
لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بۆ گەیاندنی ئەم واتایە دوو پێشگری ( هەم‌ــ)و (هو ــ) بەکاردەبرێ ( بڕوانە : ف . س . ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٣٦ ) .
( ٢٠ ) ئەمە پاشگری سیفەتی نیسبی‌یە . لە پەراوێزی ژمارە ( ٢٤ ) ی لاپەڕە ( ١١٢ ) ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا پەنجەمان بۆ ئەوە ڕاکێشاوە ، کە ( ــی )ی پاشگری سیفەتی نیسبی لەگەڵ پاشگری ( ــ ی ) ناوی مەعنادا جیاوازن‌و وێچوونی شێوەیان بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە زمانناسان بە یەك پاشگریان دابنێن ... ئەم پاشگرە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا بە شێوەیێکی چالاك‌و بە یەك چەشن دەبینرێ. هەروەها پاشگرێکی دیاری زمانە ئێرانی‌یەکانەو لە زوربەیاندا لە هەمان شێوەی کوردیدا بەکاردێ . بەوێنە لە زمانی
=



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ــ ( ــ ین ) . وەك :
زێڕین ، ئاگرین ، بەفرین ، خوێنین ، ئاسنین ...(٢١)
٣ ــ ( ــ ن in — ) . وەك:
ورگن ، تووکن ، شەرمن ، گۆشتن ، چڵکن ...(٢٢)
٤ ــ ( ــ ۆڵ ) . وەك :
کرمۆڵ ...
٥ ــ ( ــ وەر/ ــ ەوەر ) . وەك :

---

=

پشتۆدا « حکومتی ، اتومی » ( بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤١ ) . ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی ( ــ یك ) دایە ( بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٣٢ ) .

( ٢١ ) پاشگری ( ــین ) لە کرمانجیی ژووروو‌شدا زۆر بەکاردێنرێ ، وەك: گولین ، زیڤین ، زێڕین ... ( بڕوانە : چ. خ. باکایێڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت،مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٢٥٢ ــ ٢٥٣ ) . وێنەی ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی (ــ ێن )دایە ، وەك : شیرێن ، زەڕێن ... ( بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٣١ ) . لە زوربەی زۆری زمانە ئێرانیی‌یە نوێکاندا هەروەك کوردی لە شێوەی (ــ ین)دا دەبینرێ ( بڕوانە : ذوالنور ، دستور پارسی در صرف‌و نجوو املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٥٥ ؛ ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل٤٦ ) .

( ٢٢ ) هەندێ لە زانایان (ــ ن in — ) یان بە ئەڵەمۆرفی (ــ ین) داناوە ( بڕوانە : فارووق عومەر صدیق ، ڕۆنانی ناو لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا ــ کورتەی نامەی دوکتۆری ــ مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ل ٢٢ ؛ ڕ. ل. تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ، ١٩٧٨ ، ل ١٦ ... ) . من لەو ڕایەدام کە ئەو مامۆستایانە باش نیشانیان نەپێکاوەو وا دەردەکەوێ تەنیا سەیری ڕواڵەت‌و ڕوخساری پاشگرەکانیان کردووە ، چونکە وەك لێکۆڵینەوە دەریدەخا (ــ ین)و (ــ ن in — ) ئەگەرچی هەندێ وێکچوون لە نێوانیاندا هەیە ، بەڵام دوو پاشگری جیاوازو سەربەخۆن . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەش ، وێڕای جیاوازیی واتا ، دوو بەڵگە دەخەینە پێش چاو :
١ ــ پاشگری (ــ ین) چۆن دەچێتە سەر ناو هەر بەو چەشنە دەچێتە

=



منتدى إقرأ الثقافي

بەختەوەر ...(٢٣)

٦ ـ ( ـ دار ) . وەك :

ئاگادار ، ناودار ، نازدار ، زامدار ، بریندار ، دیندار ...(٢٤)

---

=

سەر ئاوەڵکرداریش ، وەك : بەرین ، پێشین ، پاشین ... هەرچی پاشگری (ـن in — )ە تەنیا دەچێتە سەر ناوو ناچێتە سەر ئاوەڵکردار.

٢ ـ یەكدوو وشە نەبێت ، بەوێنە وەك « شەرمن .. » ، كە بە هەر تەئسیرێ بێت دەكرێ بە « شەرمین ... » ، دەنا لە تێكڕای وشەكانی دیدا ـ واتە « ورگن ، تووكن ، گۆشتن ، چڵكن ... »دا ناشێ پاشگری (ـ ن in — ) بكرێ بە (ـ ین). بەپێچەوانەشەوە نالوێ لە وشەكانی « زێڕین ، ئاگرین ، بەفرین ، خوێنین ... بەرین ، پێشین، پاشین .. »دا پاشگری (ـ ین) بكرێ بە (ـ ن in — ) .

هەرچی ڕووی واتاشە بە كورتی تەنیا ئەوەندە دەڵێین ، نەك لە هەندێ باردا نێزیكی هەر لە نێوان(ـین)و (ن in — ) بەڵكو واش ڕێدەكەوێ (ـ ین) و (ـ ی) سیفەتی نیسبی لێك نزیك دەبنەوە دەبێ ئەوە لەبیر نەكەین ، كە دەوترێ « گۆشتن » مەبەست ئەوەیە « گۆشتی زۆر بێ »، بەڵام مەبەست لە « زێڕین » ، ئەوەیە « لە زێڕ دروستكرابێ » ...

( ٢٣ ) ئەم پاشگرە زۆر جار كە دەچێتە سەر ناوی سادە دەیكاتە ناوی داڕێژراو وەك : « جانەوەر ، سەروەر ... . پاشگری ( ـ وەر/ـ ەوەر ) ی كوردی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی ( ڤەر /ـوڤەر )دایە، وەك « جان ـ جانڤەر » ( گیان ـ گیانەوەر ) . بڕوانە : ف. س. ڕاستۆرگوێڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسكۆ ، ١٩٦٦ ، ل٣٥ ).

( ٢٤ ) ( ـ دار ) پاشگرێكی چالاكەو تەنیا دەچێتە سەر ناو. هەرچەندە ناوی سادە دەكاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو ، هەندێ جار ناوە سادەكە دەكاتە ناوی داڕێژراو ، وەك : گیاندار ، دووكاندار ... ئەم پاشگرە لە دیالێكتی كرمانجیی ژووروشدا هەروەك كرمانجیی خواروو دەبینرێ، وەك : گوهدار ، دەرسدار .. ( بڕوانە : چەركەزی بەكۆ ، زمانی كوردەكانی سۆڤێت ، ل ٢٤٦ ) . د. كەریمی ئەیووبیو د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا لەو ڕایەدان كە ئەم پاشگرە لە ڕەگی كرداری ئێستا ( الفعل المضارع ) ی كرداری « داشتن » ( بوون ، هەبوون ) ی فارسییەوە پەیدابووە ( بڕوانە : كتێبی « دیالێكتی كوردی موكری » ، ل ٢٨ ) . ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی نوێشدا هەر لە شێوەی ( ـدار )دا دەبینرێ ( بڕوانە : ذوالنور ، دستور پارسی در صرف و نحوو املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٥٢ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

٧ ـ ( ـ ێ ) . وەك :
کرمێ ...
٨ ـ ( ـ انه ) . وەك :
ژنانه ، پیاوانه ، منداڵانه ، زانستانه ... (٢٥)
٩ ـ ( ـ انی ) . وەك :
ژنانی ، کچانی ، کوڕانی ، شەڕانی ...(٢٦)
١٠ ـ ( ـ ەکی ) . وەك :

---

( ٢٥ ) پاشگری (ـانه) ی کوردی بەرانبەر پاشگری ( ـانەك )ی فارسیی ناوڕاست دەوەستێ . له زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (ـانەك) دەچێتە سەر ناوو دەیکاتــه ئاوەڵناو ،وەك : «مەرتانەك » (پیاوانه ) ـ (بڕوانه : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ،زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ، ١٩٦٦ ، ل ٣٠ ) .
واش پێدەچێ ئەم پاشگری (ـانه)یەی کوردی له (ـان)و (ـه) پێکهاتبێ. له وشەکانی « ژنانه ، پیاوانــه ، منداڵانه ... »دا پاشگری ( ـانه ) چووەته سەر ناوی سادەو کردوویەتی‌یە ئاوەڵناوی داڕێژراو . لـــه وشەکانی « جەژنانه ، پووشانــه » دا هەرچەنده دیسان پاشگـــری ( ـانه ) چووەتــه ســەر نــاوی ساده ، بــەڵام کردوویەتی‌یه نــاوی داڕێژراو ... له وشەکانی « پاکانه ، سوورانه » شدا چووەته سەر ئاوەڵناوی سادەو کردوویەتی‌یه ناوی داڕێژراو . وشەکانی « ژنانــه، پیاوانه ، منداڵانه ، ژیرانه ... » وەك ئاوەڵکرداریش خۆیان دەنوێنن. ئەگەر بوترێ ( جلی پیاوانه ) ، ئەوە وشەی « پیاوانه » دەبێتە ئاوەڵناو، چونکه وەسفی ناو دەکا . ئەگەر بوترێ ( شێرکۆ پیاوانه دانیشتووە )، ئەوە وشەی « پیاوانه » دەبێتە ئاوەڵکردار ، چونکه لێرەدا وەســـفی کردار دەکا ـ واته چۆنیەتی دانیشتن نیشاندەدا .
به پێویستی دەزانین پەنجه بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، که واتاو دەوری ئەو پاشگرە له وشەکانی «جەژنانه ، پووشانه ، پاکانه ، سوورانه » دا لەگەڵ وشەکانی « ژنانه ، پیاوانه ، منداڵانــه »دا زۆر جیــاوازە . ئــەمەش سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشـــێ که دوو پاشگـری سەربەخـۆ بن ( بـۆ شی‌کردنەوەو لێکدانەوەی ئــەو ڕایه بڕوانه : پەراوێزی ژمارە ٤٤ی لاپەڕە ١٢٤ ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ) .
( ٢٦ ) ئەم پاشگری ( ـانی) یەش لەوە دەچێ له نیشانەی (ـان)ی کـــۆو پاشگری ( ـی ) پەیدابووبێ . ( ـ انی ) دەچێتە سەر ئاوەڵناویــش ، وەك : تەختانی ، ڕەقانی ، نەرمانی ...



منتدى إقرأ الثقافي

خێڵەکی ، دەشتەکی . . .(٢٧)

١١ ـ ( ـ ناك ) . وەك :
غەمناك ، ترسناك . . .(٢٨)

١٢ ـ ( ـ ە ) . وەك :
هاوینە ، بەهارە ، پایزە ، زستانە . . .(٢٩)

١٣ ـ (ـوور ) . وەك :
ڕەنجوور . . .(٣٠)

١٤ ـ ( ـ اوی ) . وەك :

---

( ٢٧ ) پاشگری ( ـەکی ) دەچێتە سەر ئاوەڵکرداریش ، وەك : سەرەکی ، پێشەکی . . .

( ٢٨ ) ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستو گەلێ لە زمانە ئێرانییە نوێکاندا هەر لە شێوەی ( ـ ناك )دا دەبینرێ . بەوێنە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا « تەرسناك » ( ترسناك ) ـ ( بڕوانە : ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٣٣ ). لە زمانی پشتۆشدا « خطرناك » ( خەتەرناك ) ( بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤١ ) .

( ٢٩ ) مامۆستا نووری عەلی ئەمین لەو ڕایەدایە کە وشەی(هاوین،بەهار..) ئاوەڵکردارنو کاتێك پاشگری ( ـە )یان پێوە دەلکێ دەبنە ناو ( بڕوانە: کتێبی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی » ، ل ٨ ) . من لەو ڕایەدام کە ئەم وشانەی ناومان بردن هەرچەند وەك ئاوەڵکرداریش بەکاردەهێنرێن ، بەڵام بەر لە هەموو شتێك ناوی کات ( اسم الزمان)نو بە یارمەتیی پاشگری ( ـە ) دەبنە ئاوەڵناو ، نەك ناو .
ئەم پاشگرە جگە لەوەی ، کە یاریدەی داڕشتنی ئاوەڵناو دەدا،هەروەها یاریدەی داڕشتنی ناویش دەدا ـ واتە دەچێتە سەر ( ناوو ئاوەڵناو و کردارو ژمارە . . . ) ی سادەو دەیانکاتە ناوی داڕێژراو . بەرانبەر ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری ( ـەك ) هەیە ، کە گەلێ دەور دەبینێ ( بو تەواو ڕوونکردنەوەی ئەم باسە ، بڕوانە : پەراوێزی ژمارە ٤٢ی لاپەڕە ١٢٣ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ) .

( ٣٠ ) ئەم پاشگرە هەندێ جار ناوە سادەکە دەکاتە ناوی داڕێژراو ، وەك : دەستوور . . . هەروەها دەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادەش و دەیکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو ، وەك : مەستوور . . .



منتدى إقرأ الثقافي

ئارداوی ، شاخاوی ، کرماوی ...(٣١)

١٥ ــ ( ــ باز )(٣٢) . وەك :

مێباز ، فێڵباز ... (٣٣)

١٦ ــ ( ــ مەند )(٣٤) . وەك :

سوودمەند ...(٣٥)

١٧ ــ (ــ گین ) . وەك :

غەمگین ...

١٨ ــ (ــ زن ) . وەك :

درۆزن ...(٣٦)

ب ــ ئەو پێشگرو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادەو

---

( ٣١ ) مامۆستا نووری عەلی ئەمین باسی ئەو پاشگرەی کردووەو ژمارەیێك نموونەی بۆ هێناوەتەوە ، وەك : « کرماوی ، شاخاوی ، قوڕاوی ، خوێناوی ... » ( بڕوانە : کتێبی « گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی » ، ل ٢٨ ) . بەداخەوە هەندێ لە نموونەکانی لەبارنین‌و تیایاندا بەهەڵە چووە . ڕاستە لە وشەی « کرماوی ، شاخاوی » دا ( ــاوی) پاشگرە ، بەڵام لە وشەی « قوڕاوی ، خوێناوی ... »دا ، ( ــاوی ) پاشگر نی‌یە ، بەڵکو بریتی‌یە لە وشەی « او » و پاشگری ( ــی )ی سیفەتی نیسبی . « کرماوی ، شاخاوی ... » وشەی داڕێژراون لە وشەیێکی سادەو پاشگرێك پێکهاتوون . هەرچی « قوڕاوی ، خوێناوی ... » یە وشەی لێکدراون‌و لە دوو وشەی سادەو پاشگرێك دروستبوون .

( ٣٢ ) پاشگری ( ــ باز ) هەروەها ناویش پێكدێنێ ، وەك : سەرباز ...

( ٣٣ ) کەریمی ئەیووبی‌و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ئەو وشانەیان بە ناو داناوە ( بڕوانە : کتێبی «دیالێکتی کوردی موکری » ، ل ٢٨ . لەو ڕایەدام لەمەدا بەهەڵە چوون .

( ٣٤ ) پاشگری ( ــمەند ) زۆر جار ناوە سادەکە دەکا بە ناوی داڕێژراو ، وەك : « هونەرمەند ... » . لەبارەی ئەم پاشگرەوە ، بڕوانە : پەراوێزی ژ ٢٢ی لاپەڕە ١١٠ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە .

( ٣٥ ) پاشگری ( ــمەند ) لە زمانی پشتۆدا وەك شێوەی سلێمانی لە قاڵبی ( ــمەن )دا دەبینرێ ( بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، ل ٤١ ) .

( ٣٦ ) ڕەنگە ( زن ) پاشگرنەبێ ... لەزمانی فارسی‌دا ( زن ) ڕەگی کرداری « زدن » ( لێدان )ە .



منتدى إقرأ الثقافي

دەبكەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

یەکەم ـ پێشگر :

پێشگری ( نەـ )و ( نا ـ ) دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادەو ئاوەڵناوی دارێژراوی لێدروستدەکەن :

١ ـ (نەـ) . وەك :

نەخۆش ، نەساخ ...

٢ ـ (ناـ) . وەك :

نارێك ، ناپاك ، ناخۆش ، ناڕاست ، ناساغ ...(٣٧)

دووەم ـ پاشگر :

ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادەو ئاوەڵناوی دارێژراویان لێدروست دەکەن ، ئەمانەن :

١ ـ ( ـ انی ) . وەك :

تەختانی ، ڕەقانی ، نەرمانی ...(٣٨)

٢ ـ ( ـ ۆ ) . وەك :

بۆزۆ ، پیسۆ ...

٣ ـ ( ـ وور ) . وەك :

مەستوور ...(٣٩)

٤ ـ ( ـ ۆکە ) . وەك :

پیسۆکە ، گێلۆکە ... (٤٠)

٥ ـ ( ـەڵە ) . وەك :

---

( ٣٧ ) لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا هەردوو پێشگری ( نەـ ) و ( نـاـ ) زۆر بەکاردێ ، بەڵام لـە دیالێکتـی ژووروودا ( نـەـ ) زۆر چالاکـەو ( نا ـ ) بەدەگمەن بە کـاردێ . ئـەم دوو پێشگـرە ، کە بە ئەسل ئامرازی نەفین مۆرفێمێکی گشتیی زمانە هیندو ئەوروپاییەکانن ... لە زمانی پشتۆدا (نەـ)و (ناـ) لە شێوەی پێشگردا بەهەمان شێوەی زمانی کوردی دەبینرێن بڕوانە : ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، ل٤١).

( ٣٨ ) پاشگری ( ـانـی ) دەچێتە سـەر ناویش ، وەك : ژنانی ، کچانی ، کوڕانی ، شەڕانی ... ( لەبارەی ئەم پاشگرەوە ، بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (٢٦)ی لاپەڕە (٨٠)ی ئەم نووسراوە .

( ٣٩ ) لەبارەی ئـەم پاشگرەوە ، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٣٠)ی لاپـەڕە ( ٨١ )ی ئەم کتێبە .

( ٤٠ ) پاشگری ( ـۆکە ) دەچێتە سەر ناوی سادەش ، بەڵام هەر بە نـاوی دەیهێڵێتەوە ، وەك : بزنۆکە ، دەسڕۆکە ...



منتدى إقرأ الثقافي

نەرمەڵە ، سەوزەڵە ... (٤١)

٦ ـ (ـەڵە ) . وەك :

باریکەڵە ...

٧ ـ ( ـ ۆڵە ) . وەك :

نەرمۆڵە ، شڕۆڵە ...

٨ ـ (ـۆڵ ) . وەك :

نەرمۆڵ ، شڕۆڵ ...

٩ ـ ( ـیل ) . وەك :

وردیل ، گردیل ...

١٠ ـ ( ـکەلە ) . وەك :

سوورکەلە ، جوانکەلە ...

١١ ـ ( ـکیلە ) . وەك :

جوانکیلە ...

١٢ ـ ( ـ یلکە ) . وەك :

سپیلکە ، خشتیلکە ...(٤٢)

١٣ ـ ( ـ ۆلکە ) . وەك :

بەرزۆلکە ، تەختۆلکە ...(٤٣)

١٤ ـ ( ـ اك ) . وەك :

ڕووناك ...

ج ئەو پێشگرو پاشگرانەی دەچنە سەر ڕەگی کردار یاخود ناوی چاوگ‌و دیکەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

یەکەم ـ پێشگر :

١ ـ ( نە ـ ) . وەك :

نەمر ، نەبەز ، نەزان ، نەهات ...

٢ ـ ( بـ ـ ) . وەك :

---

( ٤١ ) ( ـەڵە ) کاتێ دەچێتە سەر ناوی سادە ، دەیکاتە ناوی دارێژراو ، وەك : گۆزەڵە ، دیزەڵە ...

( ٤٢ ) ئەم پاشگرە کە دەچێتە سەر ناوی سادە ، ناوی دارێژراوی لێ سازدەکا ، وەك : چاویلکە ، جلمیلکە ...

( ٤٣ ) هەرچەندە ئەو چەند پاشگرە بۆ بچووك‌کردنەوەی ئاوەڵناو بەکاردەهێنرێن‌و ئاوەڵناوی دارێژراو سازدەکەن ، بەڵام هەندێ لەو ئاوەڵناوە دارێژراوانە دەتوانن خۆیان وەك ناویش بنوێنن ، بەوێنە : بەرزۆکە ، مزرۆکە ... هتد .



منتدى إقرأ الثقافي

بوێر(٤٤) ، بنووس ، بکوژ ...

دووەم ــ پاشگر :

١ ــ ( ــ ۆك ) . وەك :

لەرزۆك ، گەڕۆك ...

٢ ــ ( ــ ەك ) . وەك :

نووسەك ...

٣ ــ ( ــ ار ) . وەك :

« دیار » لە « دیتن »ەوە .

...

٤ ــ ( ــا )(٤٥) . وەك :

« زانا » لە « زانین »ەوە

« توانا » لە « توانین »ەوە

٥ ــ ( ــوو )(٤٦) . وەك :

« مردوو » لە « مردن »ەوە

« نوستوو » لە « نوستن »ەوە(٤٧)

د ــ ئەو پێشگرو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵکرداری سادەو دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

---

( ٤٤ ) لە تێکستی کۆنی کوردیدا وشەی « بوێر » بە مانای « ئازا » بەرچاودەکەوێ . بۆنموونە :

**وەزیر وای گوت بە بوێری**
**چاکە قاقەزی بنیری**
**قەڵاتی بۆ شای بەجێبێلی**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٢١١ )

( ٤٥ ) وێنەی پاشگری (ــا)ی کوردی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی ( ــ اك )دا دەبینرێ . بەوێنە « داناك » کە لە « دانا »ی ڕەگی کرداری « دانستەن »و پاشگری (ــ اك ) سازبووە ؛ یاخود وشەی « ڕەڤاك » ، کە لە « ڕەڤ »ی ڕەگی کردازی « ڕەفتەن »و پاشگری (ــ اك) پێکهاتووە ( بڕوانە : ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل ٣٠ ) .

( ٤٦ ) پاشگری (ــوو) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (ــی)دا بەکاردێو دەوترێ « مردی ، نوستی ... » .

( ٤٧ ) پاشگری (ــوو) کە دەچێتە سەر چاوگی ئەلفیو یائی ، دەبێ بە (ــو W ــ) ، وەك : ڕواو ، فڕیو ...



منتدى إقرأ الثقافي

پاشگر(٤٨) :

١ ــ ( ــەکی ) . وەك :

سەرەکی ، پێشەکی ...(٤٩)

٢ ــ ( ــوو ) . وەك :

سەروو ، خواروو ، پێشوو ...(٥٠)

٤ ــ ( ــ ین ) . وەك :

بەرین ، پێشین ، پاشین ...(٥١)

## ئاوەڵناوی لێکدراو

ئاوەڵناوی لێکدراو دەکرێ پێکهاتبێ لە :

١ ــ دوو ناو . وەك :

گەردن + بلوور = گەردنبلوور

بەژن + چنار = بەژنچنار

باڵا + عەرعەر = باڵاعەرعەر

٢ ــ ناو + ئاوەڵناو . وەك :

سەر + گەرم = سەرگەرم

ڕوو + ڕەش = ڕووڕەش

دڵ + ڕەق = دڵڕەق

دەست + درێژ = دەستدرێژ

باڵا + بەرز = باڵابەرز

قەد + باریك = قەدباریك

بەخت + ڕەش = بەختڕەش

چاو + ڕەش = چاوڕەش

---

( ٤٨ ) بۆ ڕۆنانی ئاوەڵناوی دارێژراو پێشگر دەچێتە سەر ( ناوو ئاوەڵناوو کردار )ی سادە ، بەڵام ناچێتە سەر ئاوەڵکردار .

( ٤٩ ) پاشگری (ــەکی) دەچێتە سەر ناویش ، وەك : خێڵەکی ، دەشتەکی.

( ٥٠ ) ئەم پاشگرە کە دەچێتە سەر قەدی کردار هەر ئاوەڵناوی دارێژراو سازدەکا ، وەك : مردوو ، نوستوو ... ، بەڵام کە بە ناوەوە دەلکێ دەیکاتە ناوی دارێژراو ، وەك : ڕۆژوو ، پووشوو ...

( ٥١ ) پاشگری (ــین) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لەگەڵ ئاوەڵکرداردا زۆر چالاکە . ( لەبارەی ئەم پاشگرەوە بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (٢١)ی لاپەڕە (٧٩)ی ئەم کتێبە .



منتدى إقرأ الثقافي

بۆن + خۆش = بۆنخۆش(٥٢)

٣ ـ ناو + ناوی بەرکار ( اسم المفعول ) . وەك :

سەر + شکاو = سەرشکاو

زگ + سووتاو = زگسووتاو

دەست + گیراو = دەستگیراو(٥٣)

٤ ـ دوو ناو بە یارمەتیی ناوبەندی ( بە ) . وەك :

قوڕ + بە + سەر = قوڕبەسەر

لێو + بە + بار = لێوبەبار

ڕوو + بە + خاڵ = ڕووبەخاڵ (٥٤)

٥ ـ ئاوەڵناو + ناو . وەك :

خۆش + باوەڕ = خۆشباوەڕ

---

( ٥٢ ) ئەم جۆرە ڕۆنانە زۆر باوەو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو‌شدا بە هەمان چەشن دەبینرێ . بۆ نموونە :

خوون + شیرین = خوونشیرین ( خوێنشیرین )

دل + سار = دلسار ( دڵسارد )

بین + خەش = بینخەش ( بۆنخۆش )

چاڤ + ڕەش = چاڤڕەش ( چاوڕەش )

( بڕوانە : ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ـ بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو وخواروو ـ مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٨٤ ) ؛ چ باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤیت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٢٥٠ ) .

( ٥٣ ) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو‌شدا یەکگرتنی ناوو ناوی بەرکار بە هەمان شێوەی دیالێکتی کرمانجیی خواروە . بەوێنە :

دل + شکەستی = دلشکەستی ( دڵشکاو )

زەنگ + گرتی = زەنگگرتی ( ژەنگگرتوو )

( ٥٤ ) لەم حاڵەتەدا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ناوبەندەکە دەبێ بە (ب bi ) ، وەك : دەڤبخوون ... لە ناوچەی موکریانو گەرمیان ... یشدا دەبێ بە (وە) . وەك قوڕوەسەر ...

ئەم پێکهاتنە لە کرمانجیی ژووروودا زۆرە . شایانی باسە ، مامۆستا چ. باکایێف ئەمەی یادداشتکردووە ( بڕوانە : زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ٢٥٠ ـ ٢٥١ ) ، بەڵام ناتەواویی ئەوەیە ، کە وای داناوە نەك هەر دوو ناو + ناوبەندی (ب) ، بەڵکو حاڵەتی ناوێك + ئاوەڵناوێك + ناوبەندی ( ب ـ bi )ش هەیە ... من لەو ڕایەدام کە حاڵەتی دووەم ـ واتە ناو + ئاوەڵناو + ناوبەندی (ب) نییەو ...



منتدى إقرأ الثقافي

پڕ + سوود = پڕسوود (٥٥)

٦ ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی ( ە ) + ناو . وەك :

کورت + ە + باڵا = کورتەباڵا

تاریك + ە + شەو = تاریکەشەو

پیر + ە + مێرد = پیرەمێرد

٧ ـ ناو + ڕەگی‌کردار . وەك :

ئاشتی + خواز = ئاشتیخواز

بار + کێش = بارکێش

سەر + بەست = سەربەست

دەست +بڕ = دەستبڕ

پیاو + کوژ = پیاوکوژ

خێر + خواز = خێرخواز (٥٦)

٨ ـ ئاوەڵناو + ڕەگی کردار (٥٧) . وەك :

دوور + بین = دووربین

ڕەش + پۆش = ڕەشپۆش

ڕاست + گۆ = ڕاستگۆ (٥٨) .

---

=

نموونەی وا لە زمانی کوردیدا بەدی‌ناکرێ‌و تەنانەت چ. باکایێف خۆیشی هیچ نموونەیێکی بۆ ئەو حاڵەتە نەهێناوەتەوە .

( ٥٥ ) د. قەناتی کوردۆ پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە ، کە ئەم جۆرە ڕۆنانە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا زۆرەو وشەکانی «ڕەش‌بەخت ، خراب مال، خوەش‌بەخت ، پاكدل ، کیم‌بیر »ی کردووە بە نموونە ( بڕوانـــــە : دەستووری زمانی کوردی ... ل ٨٤ ) .

( ٥٦ ) ئەم جۆرە لێکدانە لە کرمانجیی ژووررووشدا زۆرە . وەك :

خوون + ڕێژ = خوونڕێژ ( خوێنڕێژ )

مێر + کوژ = مێرکوژ ( پیاوکوژ )

( بڕوانە : ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ... ل ٨٤ ) .

( ٥٧ ) کەریمی ئەیووبی‌و ئی. ئا سمیرنۆڤا هەرچەندە ناوی ئەم پێکهاتنەیـان هێناوە ، بەڵام هیچ نموونەیەکیان بۆ نەهێناوەتەوە ( بڕوانە : کتێبـــی « دیالێکتی کوردی موکری » ، ل ٤٢ ) .

( ٥٨ ) لە کرمانجیی ژووررووشدا بە هەمان شێوە بەکاردێنرێ . وەك :

دوور + بین = دووربین

خوەش + گۆ = خوەشگۆ

=



منتدى إقرأ الثقافي

٩ ـ ژماره + ناو . وەك :
دوو + دڵ = دوودڵ
چوار + چاو = چوارچاو (٥٩)
دوو + ڕوو = دووڕوو (٦٠)
١٠ ـ ئاوەڵکردار + ناو . وەك :
ژێر + دەست = ژێردەست
ژێر + چەپۆك = ژێرچەپۆك (٦١)
١١ ـ ئاوەڵکردار + ڕەگی کردار . وەك :
کەم + خۆر = کەمخۆر
زۆر + بڵێ = زۆربڵێ
١٢ ـ دووپات کردنەوە :

---

=
ڕاست + بێژ = ڕاستبێژ
( بڕوانە : ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ... ل ٨٥ ) .

( ٥٩ ) مامۆستا نووری عەلی ئەمین وای داناوە ، کە وا گوایا ئەم پێکهاتنە بریتی‌یە لە : ئاوەڵناو + ناو ( بڕوانە : کتێبی « ڕێزمانی کوردی » ، ل ١١٢ ) . ئاشکرایە ، کە ( دوو ، چوار ... ) بەر لە هەموو شتێك ژمارەن .

( ٦٠ ) ئەم جۆرە ڕۆنانە لە کرمانجیی ژووروودا زۆر باوە . بۆ نموونە :
چار + گۆشە = چارگۆشە
یەك + دەنگ = یەكدەنگ
( بڕوانە : ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی ... ل ٨٤ ) .
لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی سۆڤێتدا زۆر جار پاشگر (ـی) بە کۆتایی ئەو جۆرە وشە لێکدراوانەوە دەلکێ ، وەك :
دویقاتی ( دوونهۆم )
دویدلی ( دوودڵ )
( بڕوانە : چ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ٢٥١ ) .

( ٦١ ) شێوەی ئەم پێکهاتنە لە کرمانجیی ژووروودا بە زۆری وایە :
ئاوەڵکرداری ( کێم / کەم ) یان ( پڕ ) + ناو . وەك :
کێم + شیر = کێمشیر
کێم + ئەقل = کێمئەقل
پڕ + ئاڤ = پڕئاڤ
پڕ + ملەت = پڕملەت
( بڕوانە : چ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ٢٥١ ) .



منتدى إقرأ الثقافي

أ ) دووپات کردنەوەی ناو . وەك :
کونکون ، خاڵخاڵ ... (٦٢)
ب ) دووپاتکردنەوەی ئاوەڵناو . وەك :
وردورد ، جوانجوان ...

١٣ ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی ( و ) + ئاوەڵناو . وەك :
سوور + و + سپی = سووروسپی
کەڕ + و + لاڵ = کەڕولاڵ

١٤ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی ( و ) + وشەیێکی بێواتا . وەك :
گوڕج + و + گۆڵ = گوڕجوگۆڵ
ڕەق + و + تەق = ڕەقوتەق
نەرم + و + نۆڵ = نەرمونۆڵ (٦٣)

١٥ ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی ( ە ) + ئاوەڵناو . وەك :
سۆر + ە + شین = سۆرەشین
ترش + ە + تاڵ = ترشەتاڵ
سۆر + ە + سپی = سۆرەسپی

---

( ٦٢ ) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا کاتێ ناو دووپاتدەکرێتەوە ، پاشگری (ـی) بە کۆتایی‌یەوە دەلکێو دەوترێ : « قول قولی » ( کونکون ) ؛ « خال خالی » ( خاڵ خاڵ ) ... ( بڕوانە : چ. باکایێڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ٢٥٠ ) .

( ٦٣ ) لەدیالێکتی کرمانجیی ژووروودا کاتێ ناو دووپاتدەکرێتەوە ، پاشگری ناوبەندی (و) سازدەبن پێنج گرووپی دیاریکردووە ( بڕوانە : فارووق عومەر صدیق ، ڕۆنانی ناو لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا ـ کورتەی نامەی دوکتۆری ـ مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ل ٢١ ). ئەگەرچی لەبارەی هەندێ جۆریانەوە تێبینی‌و سەرنجم هەیە ، بەڵام بەگشتی کارێکی زانستی‌یانەو دابەشکردنێکی واقیعی‌یانەیەو مینش بۆ ئەم کارەم کەڵکم لێوەرگرتووە . یەکێ لەو تێبینی‌یانەشم ، سەبارەت بە جۆری یەکەمی ئەو پێنج گرووپەیە ، کە نووسەر تێیدا وای داناوە دوو ئاوەڵناوی سادەی هاوواتای وەك « پاك »و « خاوێن » بە یارمەتیی ناوبەندی (و) دەبنە ئاوەڵناوی لێکدراو . بە ڕای من ئەمە تەنیا هاتنی دوو ئاوەڵناوی هاوواتایە بە دوایەکداو ( و )ی پێوەندی لە نێوانیاندایەو لێکدان لە ئارادا نی‌یە ...



منتدى إقرأ الثقافي

شۆڕ + ە + تاڵ = شۆڕەتاڵ (٦٤) ، (٦٥)
... هتد (٦٦)

* * *

( ٦٤ ) د. قەناتی کوردۆ وا ڕادەگەیەنێ کە ئەم جۆرە پێکهاتنە کەمەو تایبەتە بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ( بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، ل ٨٧ ) .

( ٦٥ ) ئەم جۆرە ڕۆنانەی کرمانجیی ژووروو لە کرمانجیی خوارووودا بەم چەشنەیە : ئاوەڵناو + ناوبەندی (و) + ئاوەڵناو ـ واتە وەك جۆری ژمارە (١٣)ی ئەم باسە .

( ٦٦ ) مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا باسی بەشی هەرە زۆری ئەو ئاوەڵناوە لێکدراوانەی کردووە کە لێیان‌دواین، بەڵام ئەوەی لە باسەکەیدا جێگەی ڕەخنەبێ ئەوەیە ، کە هەندێ ئاوەڵناوی داڕێژراوی بە لێکدراو داناوە . بەوێنە وشەی « نەمر ، نەبەز ، بەهێز ، بەجەرگ ، نارێك ، بێ‌هێز ... »ی لە ژێر ئاوەڵناوی لێکدراودا باس‌کردووە .
کەریمی ئەیووبی‌و ئی. ئا. سمیرنۆڤا هەرچەندە لە زۆریان دواون بەڵام هەندێ پێکهاتنی گرنگیان لەبیرکردووە ، بەوێنە ( ژا ، ٨ ... )ی ئەم باسەی ئێمە .



منتدى إقرأ الثقافي

# پلەکانی ئاوەڵناو

لە هەندێ لەو کارانەدا کە لەبارەی ڕێزمانی کوردی‌یەوە نووسراون کێشەی « پلەکانی ئاوەڵناو » لە بەشی « وشەڕۆنان » دا باس‌کراوە (٦٧) و لە هەندێ بەرهەمیشدا لە باسی « جۆرەکانی ئاوەڵناو »دا لێی کۆڵراوەتەوە(٦٨). بۆ ڕەت‌کردنەوەی دانەنانی پلەکانی ئاوەڵناو بە حاڵەتی ڕێزمانی‌و تێ‌گەیشتنی پێوندی ( درێژ ــ درێژتر ــ درێژترین ) بە نیشاندانی پێوەندیی وشەی جیاواز ، نەك فۆرمی جیاوازی یەك وشە،گەلێك بەڵگەی زمانەوانی هەیە .

نەك لەبارەی خاسیەتی ڕۆنانی پلەکانی ئاوەڵناوەوە ، بەڵکو لەبارەی خاسیەتی حاڵەتی ڕێزمانیی پلەکانی ئاوەڵناوەوە ئەوە شایەتی‌دەدا ، کە لە فۆرمی هەمەچەشنی حاڵەتی پلەکانی ئاوەڵناودا واتای لێکسیکی ئاوەڵناو هەر یەك شتە . ڕاستە لە یەکەم تەماشاکردندا ، زۆر جار وا دێتە پێش‌چاو، کە وا جیاوازیی لە نێوان پلەکانی ئاوەڵناودا دەبێتە شتی جیاواز ، واتە بەوێنە ــ درێژو درێژترو درێژترین ــ وا پێ‌دەچێ واتای شتی جیاواز بگەیەنن . بەڵام لە ڕاستیدا درێژو درێژترو درێژترین ــ خاسیەتی هەر یەك شت ڕادەگەیەنن ، بەتایبەتی نیشانەی درێژی . بەڵام لە حاڵەتی ( درێژ )دا خاسیەتی واتای سەربەخۆیی بێ‌پێوەندێتی بە شتی‌ترەوە نیشان دەدا . لە حاڵەتی ( درێژتر )دا هەر ئەو خاسیەتە واتای بەندێتی‌و پێوەندێتی نیشان‌دەدا بە شتی‌ترەوە لە ڕێی بەراوردکردنیانەوە . فۆرمی ( درێژتر ) دوو شت ( یان دوو پۆل یان دوو دەستە ... ) بەرانبەر یەکتر ڕادەگرێ . یەکێکیان لە ئاست ئەوی تردا پتر ( درێژ )ە . لەمەوە دەبینین لە بەکارهێنانی تایبەتی

---

( ٦٧ ) بۆ نموونە :

أ ــ نووری عەلی ئەمیــن ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٣٤ ــ ٣٥ .

ب ــ محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٩ .

... و هەندێکی تر .

( ٦٨ ) بەوێنە :

ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان‌و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨٧ ــ ٨٩ .

أ ــ ڕای مامۆستا صادق بەهائەدین ، ل ٨٧ .

ب ــ لێکدانەوەی د. نەسرین فەخری ، ل ٨٧ .

ج ــ بۆچوونی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ، ل ٨٩ .

... و گەلێکی تر .



منتدى إقرأ الثقافي

ئاوەڵناو لە پلەی بەراورددا لە پێکهاتنیدا پێشبەندی ( لە ، ژ ..... ) هاوبەشی دەکات ، وەك :

**منیش لە تۆ زیاتر**
**پەسەندکەرو گوێلێگر**

( گۆران ، ل ١٠٥ )

**شەڕ ژ بێکاریێ چێترە**

( کوردۆ ، ل ٢٤٠ )

لە حاڵەتی ( درێژترین )دا نیشانەی درێژی ، هەروەك لە حاڵەتی ( درێژتر )دا سەرلەنوێ نیسبی واتا دەدا ، بەڵام جیاوازی لەگەڵ ( درێژتر )دا ئەوەیە کە فۆرمی ( درێژترین ) وا دەگەیەنێ ، کە ئەم نیشانەیە لە پلەیەکی بالادایە لە ئاست هەموو حاڵەتەکانی تری هەمان نیشانەدا . بەم پێیە ( درێژترین ) وا دەردەخا کە خاسیەتی ئەو نیشانەی شتە لەگەڵ هەموو پۆلەکانی ئەم یان ئەو شتەدا بەراورددەکرێ ، کە خاوەنی ئەو نیشانەیەنو لە نێوان هەموویاندا ئەم پلەی بالایانە . شت هەیە خۆی لە ئەسڵدا درێژ نییە ، بەوێنە ( دەرزی ) ، بەڵام دەتوانێ وەك هەرە درێژ خۆی بنوێنێ لە بەراوردکردنیدا لەگەڵ کۆمەڵە دەرزی تردا . لەمەوە دەردەکەوێ ئەگەر شت بە تەنیا وەربگیرێ ، ئەوە لەباری خاسیەتی درێژیەوە هەر دەشێ وەك ( درێژ ) تەماشابکرێ ( دەرزی درێژ ) . ئەم فۆرمەش فۆرمی چەسپیوی ئاوەڵناوە . بەکارهێنانی فۆرمی ( درێژتر ) یان ( درێژترین ) ، ئەوە نیشاندەدا ، کە شتەکە بە تەنیا تەماشانەکراوە ، بەڵکو لە بەرانبەر هاوجنسەکانی ڕاگیراوە .(٦٩)

هەر ئەو نیسبیبەت ڕاگەیاندنەی دەلالەتە ڕێ بە فۆرمی پلەی بەراوردو پلەی بالا نادات لە نێو ڕیزە وشەی تری هاوخاسیەتدا شوێنی هەمیشەیی بۆ خۆیان بدۆزنەوە . بە نموونە ، ئەگەر لەنێو ئەو ڕیزە وشانەدا کە خاسیەتی ڕادەی گەرمیو ساردی لەیەك نزیك دەخاتەوە ، ناوی وشەی « فێنك » بێنین ، ئەوە دەبینین جێکایێکی دیاریکراوی لە نێوان وشەکانی « گەرم »و « سارد »دا هەیە . بەڵام هەرچی کێشەی دەستنیشانکردنی شوێنی فۆرمی « فێنکتر »ە شتێکی ترەو جێی لێدوانە : دەمی بوونی نیسبیبەت لە گەیاندنی واتای دەلالەتی « فێنکتر »دا پێوەندی ناوبراوی لەگەڵ «گەرم»و « سارد»دا تێكدەدا . لە ڕاستیدا ئەو جۆرە حاڵەتانەی وەك : ( ئەمرۆ ساردە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دوێنێ گەرمترە نیشانی ئەوە دەدات ، کە جیاوازی لەگەڵ « فێنك ، فێنکتر »دا ، ئەوەیە دەتوانێ وا

---

( ٦٩ ) ئا. ئی. سامیرنیتسکی ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ١٩٥٩ ، ل ١٥٦ ـ ١٥٧ .



منتدى إقرأ الثقافي

ڕابگەیەنێ کە بەبێ نیسبی‌یەت « ساردتر »ە .

بەو پێیە لە هەرسێ فۆرمی پلەکانی ئاوەڵناودا مەبەست هەر یەك دەلالەتە ، بەڵام جیاوازی پلەی بەراوردو پلەی باڵا لەگەڵ پلەی چەسپیودا ، ئەوەیە ئەوان خاسیەتی نیسبی‌یان تێدایە . پلەی بەراوردو پلەی باڵا شتێك بەجیا نیشان نادەن ، بەڵکو نیشانی بەراوردیان دەدەن لەگەڵ شتی تردا .

« نیسبی‌یەت » واتای پلەی بەراوردو پلەی باڵا یەكدەخاو پێکەوە بەرانبەر پلەی چەسپیو ڕایاندەگرێ . بە واتایێکی دی سێ پلەی ئاوەڵناو لەیەك ڕادەدا نین : بەگشتی دۆخی پلەی ئاوەڵناو دابەش دەبێ بەسەر پلەی چەسپیوو پلەی نیسبی‌دا . هەرچی پلەی نیسبی‌یشە دابەش‌دەبێ بەسەر پلەی بەراوردو پلەی باڵادا .

لەبەر ئەوەی هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشان‌دەدەن ، بۆیە ڕاست نی‌یە وەك وشەی جیاجیا تەماشابکرێن ، واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن ، بەڵکو فۆرمی جۆربەجۆری یەك وشە دەردەبڕن . کەوابوو مەسەلەکە وشەگۆڕی‌یە ، نەك وشەڕۆنان .(۷۰)

ئەو بارودۆخەی کە وا ژمارەیێکی زۆر لە ئاوەڵناو پلەی بەراوردو پلەی باڵایان لێ‌پەیدا نابێ ، دژی ئەوە ناوەستێ کە پلەی بەراوردو پلەی باڵا بە حاڵەتی ڕێزمانی دابنرێن . وەك دەزانین لە بەشە ئاخاوتنەکانی تریشدا هەندێ وشە هەن بەر ئەم یان ئەو حاڵەتی ڕێزمانی ناکەون‌و ئەمە نابێتە کۆسپ‌و بەرهەڵست لە ڕێگای بوونی دەستوورە گشتی‌یەکەدا . جا بۆیە سەیر نی‌یە ئەگەر هەندێ ئاوەڵناو پلەی بەراوردو پلەی باڵایان نەبێ . ئەمەش بەندە بەوەوە کە وا ئەو دەلالەتەی ئەو ئاوەڵناوە دەیگەیەنێ لە چۆنیەتی‌دا مەودای بەراوردی نەبێ ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، دەلوێ واتای ئەو جۆرە وشانە بە ڕێگایێکی‌تر دەربیڕرێ ــ واتە بە گۆڕینی واتایان دەتوانن ئەو خاسیەتە وەربگرن‌و لە پلەی بەراوردو پلەی باڵادا بەکاربهێنرێن . بۆ نموونە :

پلەی بەراورد :

**ئەمڕۆ پرچی لە دوێنێ پتر زێڕین بوو .**

پلەی باڵا :

**ئەمڕۆ پرچی لە هەموو ڕۆژ پتر زێڕین بوو .(۷۱)**

لەبارەی ئەوەوە ، کە پلەکانی ئاوەڵناو فۆرمی ڕێزمانی جیاوازی وشەن نەك وشەی جیاجیان ، هەروەها ئەو ڕاستی‌یەش شایەتی‌دەدا ، کە هەموو پلەکان هەمیشە بە ڕێك‌وپێکی لە یەك ڕەگەوە سازدەکرێن ، لە کاتێکدا ئەو وشانەی دەلالەتی جیاواز نیشان‌دەدەن خاوەنی ڕەگی جیاوازن ، وەك :

---

( ۷۰ ) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۵۸ .

( ۷۱ ) دواتر بە درێژی لەو جۆرە حاڵەتانە دەدوێین .



منتدى إقرأ الثقافي

سارد ، فێنك ، گەرم ...

لە سەرەتادا جیاوازی لە نێوان پلەکانی ئاوەڵناودا لە زمانە هیندو ئەوروپاییەکاندا بەندبوو بە حاڵەتی تاكو جووتو کۆوە . پلەی چەسپیو پێوەندی‌یێکی دیاری‌کراوی بە ژمارەی تاکەوە هەبوو . پلەی بەراورد پێوەندی بە جووتەوە ؛ پلەی باڵا بە کۆوە هەبوو . پاشماوەی ئەو پێوەندی‌یە تاکو ئێستا لە هەندێ زماندا ماوەتەوە ، بەتایبەتی پێوەندیی کۆنی پلەی بەراورد بە ژمارەی جووتەوە .

بوونی سێ حاڵەت بە دوو ــ واتە نەمانی حاڵەتی جووتو بوونی بە کۆ ، بووە هۆی تێکدانی پێوەندیی پلەی ئاوەڵناو بە فۆرمی ژمارەوە . بەوێنە فۆرمی پلەی باڵا هاتە سەر ئەو بارەی بە هەمان دەلالەت نەك هەر لەگەڵ کۆمەڵێ شتدا بەکاربهێنرێو بەراوردبکرێ ، بەڵکو لەگەڵ دوو شتیشدا بەرانبەر یەکتر ڕابگیرێن ، کە زووتر ئەمە نەدەگونجا .(٧٢)

ئەگەرچی پلەکانی ئاوەڵناو حاڵەتی ڕێزمانین ، بەڵام هەندێ جار وا ڕووددەدات ئەو جیاوازی‌یەی پلەکان گەشەدەکات بۆ بوون بە وشەی جیاواز.

★ ★ ★

لە زوربەی زمانەکانی جیهاندا ئاوەڵناو سێ پلە ( ١ــ چەسپیو ؛ ٢ ــ بەراورد ؛ ٣ ــ باڵا ) ی هەیە . بۆنموونە لە زمانی لاتینیدا « پلەی چەسپیو ــ gradus positivus»و «پلەی بەراورد ــ gradus comparativus»و « پلەی باڵا gradus superlativus » بەرچاودەکەوێ . بۆ سازکردنی پلەی بەراورد لە زمانی لاتینیدا نیشانەی ( ior ) کە هی جنسی نێرو مێ‌یەو ( ius ) کە هــــی جنسی بێ‌لایەنە دەخرێتە سەر ڕەگی ئاوەڵناو ، بەوێنە :« longus ,a, um ــــ درێژ ، long - ior درێژتر » ( بۆ جنسی نێرو مێ)؛ « long - ius ــ درێژتــر » ( بۆ جنسی بێ‌لایەن ) . پێکهێنانی پلەی باڵاش بە هــۆی لکاندنی نیشانەکانــی « ( issimus ) - بۆ نێر ؛ ( issima ) - بۆ مێ ؛ ( issimum ) - بۆ بێ‌لایەن » ەوەیە بە ڕەگی ئاوەڵناوەوە . وەك long - issimus درێژترین » ( بۆ جنسی نێر ) » ؛ «long - issima درێژترین » ( بۆ جنسی مێ ) ؛ « long - issimum درێژترین » ( بۆجنسی بێ‌لایەن). جگە لەو ڕێگا مۆرفۆلۆژی‌یە . هەروەها هەندێ ئاوەڵناو لە ڕێگای لێکسیکی ( وەصفی ، تەحلیلی )یەوە پلەی بەراوردو پلەی باڵایــان پێ‌دەدرێ . بەوێنە

---

( ٧٢ ) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی. ئا. سامیرنیتسکی ، مۆرفۆلۆژیی زمانــی ئینگلیزی ، ل ١٥٩ .



منتدى إقرأ الثقافي

وشـەی « magis - پتر ، زیاتر » لە پێش پلەی چەسپیودا دادەنرێ‌و واتای پلەی بەراورد پەیدادەبێ ؛ یاخود وشەی « maxime - لە هەموان پتر ، لە هەموان زیاتر » دەخرێنە بەردەم پلـــەی چەسپیوو واتـــای پلـــەی باڵا سازدەبێ . . .(٧٣)

لە زمانی فەرەنسیدا پلـــەی بەراورد ( Le comparatif ) و پلەی بـــاڵا ( Le superlatif ) بە یاریـــدەی ئاوەڵکرداری چەندێتی سازدەبن‌و فۆرمی ئاوەڵناوەکە هیچ ناگـــۆڕێ . پلـەی بـەراورد ئـەگـەر بـــۆ دەربڕینـــی چۆنێتی‌یێکی بەرزتر بێ ، ئەوە وشەی « Plus ــ پتر ، زیاتر » بەکاردێنرێ . بێتو مەبەست لە ڕادەی چۆنێتی‌یەکە نزمتر بـــێ ، ئەو دەم وشەی « moins ــ کەمتر » دەوترێ . کاتێ شتە بەراوردکراوەکـــان لە یەك ڕادەدا بن ، ئەوسا وشەی « aussi ــ هەر هێندەی » یـــان « si ــ هێندەی » بەکاردەبرێن . بەشی دووەمی بەراوردەکەش بـــە یاریدەی ئامرازی ( que ) ەوە بە بەشی یەکەمـــەوە دەبەسترێتەوە . . . هەرچی پلەی باڵاشە بە یاریدەی ئامرازی ( le , la , les ) سازدەبێ‌و لە پێش وشەی دووەمی بەراوردکراوەکەشـــەوە پێشبەندی ( de ) دادەنرێ . . .(٧٤)

پلەی بەراوردو پلەی باڵا لە زمانی ڕووسیدا لە دوو ڕێگەوە سازدەبن : ١ ــ سادە ( واتە ڕێگەی مۆرفۆلۆژی ) ؛ ٢ ــ ناسادە واتە ڕێگەی لێکسیکی ) . ڕێگەی سادە بە یاریدەی هەندێ نیشانە پێكدێ : بۆ پلەی بەراورد بە زۆری نیشانەی « ee ( eu ) » بەکاردێ‌و نیشانەی « ێ ، شێ » یش ناونـــاوە. پلەی باڵا بە هۆی نیشانەی « ێیشی ( ئایشـــی ) »ەوە ڕۆدەنرێ . هەرچـی ڕێگەی ناسادەشە ، ئەوەیە کە بۆ پلەی بەراورد وشەی « بۆلێ ــ پتر ، زیاتر »و بۆ پلـــەی باڵا وشـــەی « سامیی ، ســـامەیا ، ســـامۆێ ــ هـــەرە » دەوری پێکهێنانی ئەو حاڵەتە دەبینن .(٧٥)

---

( ٧٣ ) بڕوانە :
أ ــ ن. م. لیمپێل ، زمانی لاتینی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١١٦ ــ ١٢٤.
ب ــ ف. ن. یارخـــۆ ، ف. ئی. لۆبـــۆدی ، زمانی لاتینی ، چاپـــی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ٥٢ ــ ٥٥ .

( ٧٤ ) ئێ. ئۆ. کۆستێتسـکایا ، ف. ئـــی. کارداشێفسـکی ، ڕێزمانـــی فەرەنسی ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٤٦ ــ ٤٨ .

( ٧٥ ) ئی. ئا. گولانۆف ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٠٢ ــ ١٠٤ .



منتدى إقرأ الثقافي

له زمانی ئاوێستادا بۆ پێکهێنانی پلەی بەراوردو پلەی باڵا دوو حاڵەت هەبوو :

١ ــ پێکهاتنی ڕاستەوخۆ لە ڕەگەوە .

لەم حاڵەتەدا پلەی بەراورد نیشانەی « YAS , YAS - ــ یەش ، باش » (٧٦) وەردەگرێو پلەی باڵاش نیشانەی « ISTA ــ یشتە »ی(٧٧) دەچێتەسەر .

٢ ــ پێکهاتن لە قەدی ئاوەڵناوەوە .

لەم بارەدا پلەی بەراورد نیشانەی « TARA ــ تەرە »(٧٨) وەردەگرێو لە چەند فۆرمێکیشدا شێوەی « ARA ــ ەرە » دەبینرێ. هەرچی پلەی باڵایە نیشانە « TAMA ــ تەمە »ی پێوە دەلکێو ناوەناوەش شێوەی « AMA » بەرچاودەکەوێ .(٧٩)

لە زمانی فارسیی ناوەڕاست ( پەهلەوی )دا پلەی بەراورد بە یاریدەی نیشانەی ( تەر ) پێکدێ ، وەك : « سەخت + تەر ــــ سەختتەر » ؛ « سپووك ( سووك ، ئاسان ) + تەر ــــ سپووکتەر » ... چەند وشەیێکی کەمیش لە ڕێگای گۆڕینی دەنگی ناوەندەوە پلەی بەراوردیان وەردەگرت ، « کەم ( کەم ) ــــ کێم (کەمتر ) » ؛ « ڤەس ( فرە ، زۆر ) ــــ ڤێس ( فرەتر ، زۆرتر ) » ؛ « ڤەهـ ( باش ) ــــ ڤێهـ ( باشتر ) »... نیشانەی هەرە باوی پلەی باڵا « تـوم » بوو ، وەك : « خوەس ( خاس ، باش » ــــ خوەستوم ( خاسترین ، باشترین ) » ... هەرچی نیشانەی ( یست )ە کەمتر بەکاردەهێنرا ، وەك : « مەسیست ( مەزنترین ) » ...

لە ڕستەدا کە بەراوردی دوو شت دەکرا پیشبەندی « هەرچ » یان « کوو » ... بەکاردەهێنران ، کە واتای « لە »ی کوردی دەگەیەنن . هەرچی پیشبەندی ( هەرچ )ە بۆ پلەی باڵاش بەکاردەهێنرا ...(٨٠)

لە زمانی فارسیی نوێدا نیشانەی (تەر) پلەی بەراوردو ( تەر + ین) پلەی باڵا سازدەکەن .(٨١)

---

( ٧٦ ) لە هیندی کۆندا دەبێتە « یەس ، یانس » .

( ٧٧ ) لە هیندی کۆندا بووە بە « یشتهە » .

( ٧٨ ) لە هیندی کۆنیشدا هەر « تەرە »یە .

( ٧٩ ) س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٤٢ــ٤٣.

( ٨٠ ) ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ،١٩٦٦، ل ٥٣ ــ ٥٤ .

( ٨١ ) ذوالنور ، دستور پارسی در صرفو نحوو املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٥٦ ــ ٥٧ .



منتدى إقرأ الثقافي

پلەی بەراورد لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا بە پاریـــــدەی نیشانەی ( تر ) پێكدێ‌و لە دیالێکتی ڕۆژهەڵاتیشدا بە هۆی ( تر ، تەر ) ەوە. پلـــەی باڵاش لە هەردوو دیالێکتدا لــە پلەی بەراوردو هــەندێ جێنـــاو پەیدادەبێ‌و هەندێ وشەش لە دیالێکتی ڕۆژئاوادا بە پاریدەی نیشــــانەی ( ترین ) سازدەبێ .(٨٢)

لە زمانی پشتۆدا پلەی بەراورد بە پاریدەی پێشبەندی(٨٣) (تر) پێكدێ‌و پلەی باڵاش بە هۆی دەستەواژەی ( تر تولو )ەوە سازدەبێ ، وەك :

احمد تر محمود مشردی ( ئەحمەد لە مەحموود گەورەترە )

احمد تر تولو مشردی ( ئەحمەد لە هەموان گەورەترە ) .(٨٤)

★ ★ ★

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە سێ جۆرە :

١ ــ پلەی چەسپیو .

٢ ــ پلەی بەراورد .

٣ ــ پلەی باڵا .

پلەی چەسپیو کە ئاوەڵناوێکی ڕووتەو هیــچ نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی نی‌یە ( تیژ ، گەرم ، سوێر ، سوور ، ترش ، تاڵ ، سەوز ، ئازا ، ناســك ، پاك ... بێبەرهەم ، بەختەوەر ، ئاگادار ، غەمناك ، نازدار ... سەرگەرم ، قوربەسەر ، سەربەست ، ڕاستگۆ ... ) دەبێتە بناغەی دروســتبوونــی پلەی بەراوردو پلەی باڵا .

چەند نموونەیێك :

**دەموت دو چاوی خۆمە ئەگەر ( بەکرەجۆ )یی ئەشك**
**ئەبوایە تیژو بێ‌ئەمەر و گەرم و سوێر و سوور**

( نالی ، ل ١٨٠ )

**لەجێ‌مانەوە ترش و تاڵت دەکا**
**ترێ بوو بە سرکە ، عەسەل بوو بە سەم**

( مەحوی ، ل ٢٣٦ )

لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا بۆ ڕۆنانی فۆرمی پلەی بەراورد دوو ڕێگەی سەرەکی هەیە :

---

( ٨٢ ) ف. ئا. فورۆلۆفا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٠ .

( ٨٣ ) بینیمان لە زمانەکانی دیدا ( تــر ) نیشانەیە ، بــەڵام لە پشتــۆدا پێشبەندە .

( ٨٤ ) ن. ئا. دڤۆریانکوڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٠ .



منتدى إقرأ الثقافي

١ ــ ڕێگەی مۆرفۆلۆژی (٨٥) ، کە ئەویش بە یارمەتی نیشانەی ( تر )ەوە دەخرێتە سەر ئاوەڵناوی چەسپیو .
وەك :

خۆش + تر ـــــ خۆشتر
چاك + تر ـــــ چاکتر
باش + تر ـــــ باشتر

نموونە :

**زەردەخەنەکەت پڕنەشئە وەك مەی**
**گڕوگاڵەکەت خۆشتر لە صەد نەی**

( بێکەس ، ل ١٥٤ )

**وتی : ڕاستە منیش باوەڕ ئەکەم‌و ئەزانم کە وایەو بۆ ئێمە ئەمە چاکەو لەوە چاکترو باشتر چارەیێك نی‌یە .**

( لە خەوما ، ل ٦١ )

لەو ڕستەیەشدا کە بەراوردی تێدا دەکرێ پێشبەندی ( لە ) دەخرێتە نێوان ئەو دوو وشەیەوە یان ئەو دوو دەستەواژەیەوە یان ئەو دوو ڕستەیەوە ــ بە واتایێکی‌تر ئەو دوو شتەوە ــ کە بەراوردکرێن(٨٦) .

---

( ٨٥ ) ئەم ڕێگەیە دەشێ پێشی بوترێ شێوەی سادە یان شێوەی ڕۆنـراو .
( ٨٦ ) باسی شوێنی هاتنی پێشبەندی ( لە ) لە باری پلـەی بەراورددا لای نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بە جۆری جیاواز دەربڕراوە . بە وێنە :
د. قەناتی کوردۆ دەڵێ : « ... ( لە ) دەکەوێتە پیش ئـــەو ناوەی پلەی نزمتری پێدەبەخشرێ » ( د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانـــی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی‌و سۆرانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ . د. کوردستان موکریانی لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە کوردی ، ل ١٠٥ ). لەبارەی ئەم دەربڕینەی مامۆستا کوردۆوە سێ سەرنج نیشان‌دەدەین :
١ ــ ڕاست نی‌یە وا دەرببڕرێ ، کـــە ئەو وشەیەی بەراوردەکەی لەگەڵدا دەکرێ دەبێ ناو بێ ، چونکە هەندێ بەشە ئاخاوتنی دیش ، وەك ( جێناو ، چاوگ ، ژمارە ... ) دیسان لە نێوانیاندا بـــەراورد دەکرێ . وەك :

تۆ لە من ئازاتری
ڕۆیشتن لە ڕاکردن خۆشترە
پێنج لە چوار زیاترە

٢ ــ نەك مەرج نی‌یە ئەو شتەی بەراوردەکەی لەگەڵ دەکرێ هــەر ناوبێ ، بەڵکو مەرج نی‌یە وشەیەکیش بێ ، چونکە وەك ئاشکرایــە ،
=



منتدى إقرأ الثقافي

چەند نموونەیێك :

**ترێ لە سێو خۆشترە**

**ترێ گەلێکی زۆرەو لە سێویش خۆشترە**

**نازەنین لە تۆ زیرەکترە**

**نازەنین ئەگەرچی کچێکی سستە ، بەلام لە تۆ زیرەکترە**

**زانین لە نەزانین چاکترە**

**زانین ئەگەر کەمیش بێ لە نەزانین هەر چاکترە**

**یەك لە دوو ئاسانترە**

**یەك جار بێت لە دوو جار ئاسانترە .**

**...هتد .**

---

دەشێ دەستەواژەیێك یاخود ڕستەیەکیش بێ . بە نموونە :
نەسرین لە هەزار پیاوی ترسنۆك باشترە .
نەسرین لە ئەو پیاوانەی هەمیشە نووستوون باشترە .

٣ ــ ڕاستە ، کە دەوترێ « ئازاد لە نەوزاد ئازاترە ؛ نەسرین لە لانە جوانترە ... ) ئەوە پلەی نزمتر بە وشەی دووەم دەبەخشرێ ــ واتە بە « نەوزاد »و « لانە » ــ جا ئەمە وا ناگەیەنێ ، کە هەمیشە پلەی نزمتر بە وشەی دووەم دەدرێ . وەك دەزانین ، ئاوەڵناوی واش هەیە پلەی نزمتر بدا بە وشەی یەکەم ، نەك دووەم . بە نموونە ئەگەر بوترێ « ئازاد لە نەوزاد ( سووکترە ، نزمترە ، پیسترە ، خراپترە ، کیلترە... ) ؛ « نەسرین لە لانە ( ناشیرینترە ، وشکترە ، چەوترە ، سسترە ... » ، ئەوە وشەی یەکەم ــ واتە « ئازاد »و « نەسرین » ــ پلەی نزمتریان پێدراوە ...

کەواتە وشەی یەکەم نە مەرجە هەر ناوبێ‌و نە مەرجیشە هەمیشە پلەی نزمتر بە وشەی دووەم ببەخشرێ .

لە کتێبی قوتابخانەکاندا لەبارەی شوێنی پێشبەندی (لە)وە نووسراوە : « ( لە ) دەخرێتە نێوان هەردوو ناوەکەوە » ( زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٩ ) . دەربارەی ئەم دەربڕینەش دوو تێبینی دەخەینە پێش‌چاو :

١ ــ بەڵێ لە ڕستەی وەك « دارا لە ئاری باشترە » دا پێشبەندی (لە) لە نێوان هەردوو ناوەکەدایە ، بەلام ئەگەر بوترێ « دارا کوڕێکی چاکەو یارمەتی هەژاران زۆر دەدات‌و لە ئاری باشترە » ، ئەوە ناکەوێتە نێوان دوو ناوەکەوە ، بەڵکو دەکەوێتە پێش ناوی دووەم . بێتو بوترێ :



منتدى إقرأ الثقافي

له تێکڕای ئەو نموونانەدا دەبینین ، ئەو ئاوەڵناوانەی نیشانەی (تر)یان وەرگرتووەو پلەی بەراورد ڕادەگەیەنن ، کەوتوونەتە دوا ئەو دوو وشەیەوە ، کە لەگەڵ یەکتردا بەراورد کراون ... بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین ، کە لە زمانی کوردیدا ئەوەش دەبینرێ ، کە ئاوەڵناوەکە دەکەوێتە نێوان دوو وشە یان دوو دەستەواژە یان دوو ڕستە بەراوردکراوەکەوە . وەك :

**کانییێکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو :**
**لە بنیا بلەرزی مرواری زیخو چەو ،**
**جوانترە لە لای من لە دەریای بێسنوور**
( گۆران ، ل ٤٦ )

**زاوای بەردەگای ئاواتی دڵ ( عیو ! )**
**بووکی ڕازاوەی جوانترە لە گوڵ ( عیو ! )**
( گۆران ، ل ١٤٩ )

**... کابرای کاروانچی وتی باوکم خوا هەڵناگرێ ئێوە سەعاتێ زیاترە ، بەم تاریکەو سەرماو لێزمەیە ، ئێمەتان لەم قوڕەدا ڕاگرتووە .**
( لە خەوما ، ل ٣٤ )

---

=

« پیاوی ئازا لە پیاوی ترسنۆك باشترە » ، ئەوە دەکەوێتە نێوان دوو دەستەواژەوە ... هتد .

٢ ـ ئەگەرچی باشە دانەران لە پەراوێزدا ، ئەوەیان وتووە ، کە « دەتوانین لە جێی دوو ناوەکە ، ڕاناویش بەکاربهێنین » ( ل ٦٩ ) ، بەڵام وەك پێشتر ڕوونمانکردەوە ، دەشێ هەندێ بەشە ئاخاوتنی دیش بەکاربهێنرێ .

د. کەریمی ئەیووبیو د. ئی. ئا. سمیرنۆڤا ( دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد ، ١٩٦٨ - ل ٣٩ ) و د. نەسرین فەخریو د. کوردستان موکریانی ( ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٢ ، ل ٩٢ ) و د. زارێ یووسف ( دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ ، ل ٣٨ ) ... وایان دەربڕیوە ، کە ( لە ) دەکەوێتە پێش ئەو ناوەی بەراوردەکەی لەگەڵ دەکرێ . ئەم نووسەرانەش کەوتوونەتە دوو هەڵەوە :

١ ـ وەك وتمان ئەو وشەیەی بەراوردەکەی لەگەڵ دەکرێ ، مەرج نییە هەر ناو بێو بەڵکو دەشێ ( جێناو ، چاوگ ، ژمارە ... )ش بێت.

٢ ـ بەشی دووەمی بەراوردەکە نەك هەر مەرج نییە ناو بێ ، بەڵکو مەرج نییە وشەیەکیش بێ ، چونکە هەڵکەوتی زمانی کوردی ئەوە نیشاندەدا کە ئەو شتەی بەراوردی لەگەڵدا دەکرێ ، دەشێ لە دەستەواژەیێك یان ڕستەیەکیش پێکهاتبێ .



منتدى إقرأ الثقافي

**لەو بەرزیەدا ئاوازی شایی**
**بەرزتر لە تەپڵو ئاوازەی شایی**
... هتد .

ئەو ڕێگە سەرەکیەی لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا فۆرمی پلەی بەراورد ڕۆدەنێو لێی دواین ، لە ناوچەی موکریانو سۆران ... یشدا بە هەمان شێوە دەبینرێن . بەوێنە :

**خولا لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە**
( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ١٨٦ )

**ئەوان لە مە بەغیرەتترن**
( تحفەء مظفریە ، ب٢ ، ل ٥ )

**ڕۆڵە ، ئەو ئەنگوستیلەی هەڵگرە ، لە پادشایەتیی تۆ چاترە .**
( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ١٩٦ )

**کوڕە کەچەر وەرە پێشتر**
**دەمو لێوت کەڵلەی شەکر**
**تەتۆ لۆ من لە برام چێتر**
( فۆلکلۆر ، ل ١١٩ )

...و گەلێکی تر .(٨٧)

٢ ــ ڕێگەی لێکسیکی(٨٨) ، ئەمیش بە یارمەتیی وشەی وەك ( پتر ، زیاتر ، زۆرتر ، کەمتر ... ) سازدەبێ . وەك :

پتر جوانە
زیاتر ئازایە
کەمتر ترشە
زۆرتر باریکە
... هتد .

---

( ٨٧ ) لەم بەشە دیالێکتانەشدا ، هەروەك زمانی ئەدەبی ، ئەو حالەتەش دەبینرێ . کە ئاوەڵناوەکە بکەوێتە نێوان دوو بەشە بەراوردکراوەکەوە. بەنموونە :

**مامەکم هەیە لە زووری**
**سەری گەورەترە لە ( هووری )**
( فۆلکلۆر ، ل ١٢ )

( ٨٨ ) ئەم ڕێگەیە دەشێ پێشی بوترێ ڕێگەی ناسادە یان شێوەی وەسفی.



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم ڕێگەیە بە هەمان شێوە لە بەشە دیالێکتی موکریان‌و سـۆران ... یشدا خۆی دەنوێنێ .

هەرچی نیشانەی ( تر )ە ، کە لە بەشە دیالێکتەکانـی سایمانـی‌و موکریان‌و سۆران ... دا نیشانەی بەراوردە لە شێوەی هەوراماندا لـه وێنەی ( تەر )دا بەدەردەکەوێ ، وەك ( مەزنتەر ) ...(٨٩)

بۆ نموونە :

**فەرشێ پەی شیرین شۆخ شیرین‌ڕەنگ**
**خاستەر چە دیبای کارخانەی فەرەنگ**

( خانای قوبادی ، ل ٦١ )

**نمانا ظولمەت چیهرەی سەوادی**
**سیاتەر چە بەخت ( خانای قوبادی )**

( خانای قوبادی ، ل ٥٧ )

**واتش : ئەی مەژنوون سالار سەرمەشق**
**بەدبەختەر چە من تۆ چە سەودای عەشق**

( میرزا ئۆلقادر ، ل ٩١ )

**تێبینی :**

لە بەشە دیالێکتی هەورامانی‌دا دوو شت سەرنج ڕادەکێشێ :

١ ـ ئەو نموونانەی لەبەر دەستتان ، ئەوە نیشان‌دەدەن ، کـه ئاوەڵناوەکە دەکەوێتە نێوان دوو شتە بەراوردکراوەکەوە ، نەك دوایانەوە .

٢ ـ ئەو پێشبەندی ( لە )یەی لە دیالێکتی خواروودا‌و ئەو ( ژ )ەی لـه دیالێکتی ژووروودا لە بەراوردەکەدا دەور دەبینێ ، لەم بەشە دیالێکتـەدا لە شێوەی ( چە )دا بەدەردەکەوێ .

لە ئەدەبی زووی کاکەییەکاندا ، وەك ناوچەی هەورامان نیشـانەی ( تەر ) بەکارهێنراوە . هەرچی پێشبەندەکەشە لە شێوەی ( چە )دایـه . بەڵام ئەدەبی نوێی کەوتۆتە ژێر تەئسیری زمانی ئەدەبی‌و نیشانەی ( تـر )و پێشبەندی ( لە ) جێی ( تەر )و ( چە )یان گرتۆتەوە .

نموونە بۆ ئەدەبی کۆن :

**موئمین ئەو کەسەن بۆ چە قال**
**وێش کەمتەر گێرۆ چە ئەدنای منال**

( حیلمی ، ل ٨٥ )

نموونە بۆ ئەدەبی نوێ :

**یەك لە یەك ڕەشتر زوڵف لەگەڵ پەرچەم**

---

( ٨٩ ) محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٨٨ .



منتدى إقرأ الثقافي

**گۆنای گوڵێك بوو لە باخچەدا كەم**

( سەی وەهاب ، ل ٨٧ )

وێڕای ئەو دەستوورە گشتییانەی خۆنواندنی پلەی بەراورد ، چەند حاڵەتێكی دیش دێتە پێشچاو ، كە بە پێویستی دەزانم سەرنجی خوێنەریان بۆ ڕابكێشم :

١ ــ ڕستەی وا هەیە ، ئەگەرچی ئاوەڵناوەكەی نیشانەی ( تر ) ی پێوەیە ، بەڵام پێشبەندی ( لە ) و ئەو شتەی لە گەڵی بەراورددەكرێ ، تێدا نییە . ئەمیش سێ جۆرە :

أ ) لە ڕستەكانی پێشتردا ئەو شتەی لە گەڵی بەراورددەكرێ وتراوە . بە نموونە لە دێڕی ( ٩ ــ ١٠ ) ی كتێبی « لە خەوما » دا وتراوە : « ئەویش وتی باشە ، ،بەڵام جارێ هەر لیرەكان بگۆڕینەوە باشترە » . ڕاستە لەم ڕستەیەدا ئاشكرا نییە كە گۆڕینەوەی لیرە لە گۆڕینەوەی چ دراوێكی دی چاكترە . بەڵام لە دێڕی ( ٧ ــ ٨ ) دا ناوی « بانقەنەوت »و « هەزار ڕوپیەیی» براوە ، كەواتە كورتەی وتراوەكە ئەمەیە « گۆڕینەوەی لیرەكان لە بانقەنەوتو هەزار ڕوپیەیی چاكترە » ...

ب)لە ڕستەكانی پێشتردا ، ئەگەرچی ئەو وشەیە یان ئەو دەستەواژەیە یان ئەو ڕستەیەی لە گەڵی بەراورددەكرێ دەقاودەق نەوتراوە ، بەڵام ،بە شێوەیێكی تر نیشاندراوە . بە نموونە لە لاپەڕە ( ٥٠ ) ی هەمان كتێبدا قارەمانی چیرۆكەكە بە دوورو درێژی باسی ئەوە دەكات ، كە بە پەیدابوونی هەندێ پیاوی زاناو تێگەیشتوو دڵی خۆش دەبێ ... و ئنجا لە دوا دێڕدا دەڵێ : « هەتا ئەهات ئومێدم زلتر ئەبوو » . بێگومان دیارە خاوەنی ئەو وتانە مەبەستی ئەوەیە بڵێ : « هەتا ئەهات ئومێدم لە ئومێدی جاران زلتر ئەبوو » .

قارەمانی هەمان چیرۆك لە لاپەڕە ( ٣٢ )ەوە تا كۆتایی لاپەڕە ( ٣٤ ) بەسەرهاتو ئیقەومانو نەگبەتیو تەنگوچەڵەمەو نەهاتی خۆی دەگێڕێتەوەو لە كۆتاییدا دەڵێ « خوا لەوە خراپتر نەدا » . لێرەدا ( لە ) پێشبەندەكەیەو ( وە ) ش كە كورتكراوەی ( ئەوە ) یە دەگەڕێتەوە بۆ هەموو بەسەرهاتەكە.

ج ) ئەو شتەی بەراوردەكەی لەگەڵ دەكرێ لە هیچ شوێنێكدا نەوتراوە، بەڵام لە ناوەرۆكدا هەیە . بەوێنە لە دێڕی (٦ ) ی لاپەڕە ( ٥٣ ) ی بەرهەمی ناوبراوی مامۆستا جەمیل صائیبدا وتراوە : « وا چاكە ئەم ئیشانە سەعاتێك زووتر جێبەجێ بكرێ » و پێشتریش هیچ ئیشارەتێك نییە بۆ ئەوەی « ئەو ئیشانە » لە كاتی خۆی دوا خرابن یان پێویست بن لەپێش وەختدا جێبەجێ بكرێن ، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەرۆكدا دیارە كە مەبەست وایە : « وا چاكە ئەم ئیشانە لە وەختێكدا بكرێ لە كاتێ زووتر بێ » .



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ شێوه بەراوردێك هەیە هەردوو شتە بەراوردکراوەکەی تێدایە ، بەڵام پێشبەندی ( لە ) نییەو ئامرازی ( یا ، یان ، یانە ، یاخود .. ) بەشداری دەکات . ئەمیش دوو چەشنە :

ا ) ئەوانەی ئاوەڵناوەکەی نیشانەی ( تر ) وەردەگرێ .

وەك :

**نەسرین جوانترە یان لانە .**

**ڕاوی کەروێشکێ خۆشترە یانە ئەو ماچانە .**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٥ )

ب ) ئەوانەی ئاوەڵناوەکەی نیشانـــەی ( تر ) ی ناچێتە سەر ، وەك :

**ڕوومەتی کاکە مەم زەریفە ، یان چراو فەنەرە**

( تحفەء مظفریە ، ب ١، ل٢٢٨)

...هتد .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا هەر ( تر ) نیشانەی پلەی بەراوردە، بەڵام پێشبەندی ( ژ ) لە جێی ( لە ) دێت .

چەند نموونەیێك :

**مە ژ زولفێن د بوتان ڕشترە بەخت**

**سەحەران تێت پەری پێ نە حسین**

( جزیری ، ل ٣٢٠ )

**شەڕ ژ بێکارییێ چێترە**

( کوردۆ ، ل ٢٤٠ )

**هەبی نەبی چو ژ خودێو پێغەمبەرا مەستر نەبی .**

( خالید حسەین ، ل ٧ )

... و گەلێکی تر .

لە دیالێکتی کرمانجیـــی ژووروشدا ، هـــەروەك دیالێکتی کرمانجیی خواروو ، ئەوەش بەدی دەکرێ ، کە ئاوەڵناوەکە بکەوێتە نێوان دوو بەشـــە بەراوردکراوەکەوە . وەك :

**دەوێ جیرباندی چێترە ژ ماسێ نە جیرباندی**

( کوردۆ ، ٢٣٥ )

لەم دیالێکتەشدا هەروەك لە دیالێکتی خوارووودا ، ئەو شێوە بەراوردە هەیە ، کە ئامرازی ( یا ، یان ... ) لە بریتی پێشبەندی( لە) بەشداریدەکات.

وەك :

**ئەز جانترم یان تۆ ؟**

( خالید حسەین ، ل ٢٦ )

لە بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤیێتدا هەندێ جار بەبێ پێشبەندی ( ژ ) بەراوردەکە پێكدێ ـ واتە ( ژ ) بەشداری ناکات . وەك :



منتدى إقرأ الثقافي

★ کەچکا من کەچکا تە ڕندترە
★ نیاز من ڕندتر لۆ دکە
★ ڕێیا تە ئی مە درێژترە
... هتد (٩٠) .

لە تەك ئەو ڕێگە مۆرفۆلۆژی‌یەدا ، ڕێگەی لێکسیکی‌یش هەیە ، کە بە هۆی وشەی ( دها ) وە (٩١) سازدەبێ . وەك :

**ئەز ڤیزا دها بەدەو بخوەزم**

**ـ واتە ( من کچێکی پتر جوانم دەوێ ) (٩٢)**

لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا وشەکانی ( ژ ، هێ ، داها / دها ) و لە بەشە دیالێکتەکانی تری کوردەکانی سۆڤێتدا ( ژە ، هی ) لەگەڵ پلەی چەسپیو دێن و پلەی بەراورد پێكدێنن . لەم بارەدا پێشبەندی (ژ/ژە) لە پێش ئەو وشەیەوە دادەنرێ کە بەراوردەکەی لەگەڵدا دەکرێ و وشەکانی ( هێ ، هی ، داها / دها ) لەپێش ئاوەڵناوەکەوە ، وەك :

★ **ئەو ئی ژ تە ئاقلە ( ئەو پتر لە تۆ ئاقلە ـ ئەو لە تۆ ئاقلترە ) .**

★ **ئەلەگەز بلندە لێ ئێگرداغ هێ بلندە ( ئەلەگەز بلندە ، بەڵام ئاگری‌داغ پتر بلندە ـ ئەلەگەز بلندە ، بەڵام ئاگری‌داغ بلندترە ) .**

★ **ناها مە ڕند دژین ، لێ‌سبائەمە هێ ( داها/دها) رند بژین ( ئێستا ئێمە باش دەژین ، بەڵام سبەینێ پتر باش دەژین ، ئێستا ئێمە باش دەژین ، بەڵام سبەینێ باشتر دەژین ) .**

★ **ئەم سالا ١٩٦٠ دها ڕند بخەبتن ( ئێمە لە سالی ١٩٦٠دا پتر باش کاردەکەین ـ ئێمە لە سالێ ١٩٦٠دا باشتر کاردەکەین ) .**

---

( ٩٠ ) بڕوانە : د. چەرکەزی بەکۆ ( باکایێف ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١١٧ .

( ٩١ ) شایانی باسە ، د. قەناتی کوردۆ باسی ئەو جۆرە بەراوردەی کردووە ، بەڵام لەوەدا باش بۆی نەچووە ، کە دەڵێ لە کرمانجیی خواروودا لەبریتی ( دها ) وشەی ( هێشتا ) ئەو دەورە دەبینێ ( د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ . د. کوردستان موکریانی لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە کوردی ، ل ١٠٥ ) . هۆی ئەم هەڵەیەش ئەوەیە ، کە وشەی ( دها ) لە کرمانجیی ژووروودا دوو مانای سەرەکی هەیە : (١ـ هێشتا ؛ ٢ـ زیاتر ، پتر ) . جا نووسەر ئەگەر مانای دووەمی ( دها)ی وەربگرتایە ، ئەوە تووشی ئەو هەڵەیە نەدەبوو .

( ٩٢ ) د. قەناتی کوردۆ بەهەڵە ئەو نموونەیەی کردووە بە دیالێکتی خواروو، وتوویە : « من کچەکەی هێشتا جوانم دەوێ » .



منتدى إقرأ الثقافي

.... هتد (٩٢)

له زمانی ئەدەبیی کوردیدا پلـەی بالآش هەروەك پلەی بەراورد لە دوو ڕێگەوە ڕۆدەنرێ :

١ ــ ڕێگەی مۆرفۆلۆژی ، کە ئەویش بەیارمەتی نیشانەی ( تر + ین= ترین ) سازدەبێ . واتە یان ( ین ) دەخرێتە سەر ڕێژەی پلەی بەراورد یـان ( ترین ) دەخرێتە سەر پلەی چـەسپیو . وەك : جوانترین ، ئازاتـرین ، ناسکترین ...

**ئەمەوێ کە دەرچووم لەم دێیە بەیانی**
**خاتیرەم هەڵگرێ جوانترین نیشانی !**

( گۆران ، ل ٢٦ )

کاتێ نیشـانەی ( تر ، یاخـود ( تر + ین ) دەخرێتـە سەر وشەیێـك ، هەندێ دیاردەی فۆنەتیکی دێتە کوڕێ :

١ ــ ئەگەر وشە کۆتایی بە دەنگـی ( ت ) بێتو دەنگـی پێشیشیـەوە نەبزوێن بێ ، ئەوە لە دەربڕینـدا یەکێـك لەو دوو ( ت ) ە ــ واتە ( ت )ی کۆتایی وشەکە یان ( ت )ی سەرەتای نیشانە ــ قووت دەدرێ . ئەمەش بەر یاسای کورتکردنەوەو تێداچوون (٩٤) دەکەوێ . وەك :

کورت + تر ( تر + ین ) = کورتر ، کورترین
پت(٩٥) + تر ( تر + ین ) = پتر ، پترین
درشت + تر ( تر + ین ) = درشتر ، درشترین
ڕاست + تر ( تر + ین ) = ڕاستر ، ڕاسترین
خەست + تر ( تر + ین ) = خەستر ، خەسترین

٢ ــ بێتو وشە کۆتایی بە دەنگی (ت) بێتو دەنگی پیشی‌یشیەوە بزوێن یان نەبزوێنی ( و ــ W )و ( ی ــ Y ) بوون ، ئەوە هەردوو ( ت )ەکە دەوترێن . وەك :

(ا) : مات + تر ( تر + ین ) = ماتتر ، ماتترین
(ە) : بلیمەت + تر ( تر + ین ) = بلیمەتتر ، بلیمەتترین
(وو) : پەڕپووت + تر ( تر + ین ) = پەڕپووتتر ، پەڕپووتترین
(و) : قوت + تر ( تر + ین ) = قوتتر ، قوتترین

---

( ٩٣ ) بڕوانە : د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییێف ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١١٧ ــ ١١٨ .

( ٩٤ ) بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبارەی یاسای کورتکردنەوەو تێداچوونەوە، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥٤ .

( ٩٥ ) واتای : کەم ، تۆز ، پچ ... دەگەیەنێ .



منتدى إقرأ الثقافي

(ی) : زیت + تر ( تر + ین ) = زیتتر ، زیتترین
(یَ) : شێت + تر ( تر + ین ) = شێتتر ، شێتترین
(و— W : چەوت + تر ( تر + ین ) = چەوتتر ، چەوتترین .
... هتد .

٣ ــ ئەگەر وشە کۆتایی بە دەنگی ( د ) بێت ، ئەوە لە دەربڕیندا (د)ەکە ناوترێ . هۆی ئەمەش کلۆرکردنە یان تواندنەوە .(٩٦)
وەك :

زیاد + تر ( تر + ین ) = زیاتر ، زیاترین
بڵند + تر ( تر + ین ) = بڵنتر ، بڵنترین
توند + تر ( تر + ین ) = تونتر ، تونترین
سارد + تر ( تر + ین ) = سارتر ، سارترین

٤ ــ بێتو وشە کۆتایی بە دەنگی ئاوازەداری (ز ، ژ ...) بێ ، ئەوە کپ دەبن و وەك (س ، ش ...) دەوترێن . لێرەدا بەر یاسای تواندنەوە دەکەون . وەك :

بەرز + تر ( تر + ین ) = بەرستر ، بەرسترین
تیژ + تر ( تر + ین ) = تیشتر ، تیشترین

٥ ــ ئەگەر وشەیێك کۆتایی بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن ( جگە لە « ت ، د ، ز ، ژ » ) بێت ، ئەوە بێ هیچ گۆڕانێك « تر + ین » وەردەگرێ، وەك :

گەورە + تر ( تر + ین ) = گەورەتر ، گەورەترین
سپی + تر ( تر + ین ) = سپی‌تر ، سپی‌ترین
ماندوو + تر ( تر + ین ) = ماندووتر ، ماندووترین
......
خراپ + تر ( تر + ین ) = خراپتر ، خراپترین
سوور + تر ( تر + ین ) = سوورتر ، سوورترین
تەڕ + تر ( تر + ین ) = تەڕتر ، تەڕترین
پیس + تر ( تر + ین ) = پیستر ، پیسترین
باش + تر ( تر + ین ) = باشتر ، باشترین
پاك (٩٧) + تر ( تر + ین ) = پاکتر ، پاکترین

---

( ٩٦ ) بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبارەی یاسای کلۆرکردنو تواندنەوەوە ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی . بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل ١١٨ ــ ١٢٧ .
( ٩٧ ) بەلام وشەی ( چاك ) لە نێوانیاندا بیژۆکەو زۆر جار دەنگی ( ك )ەکەی قووت‌دەدرێو دەوترێ (چاتر ، چاترین ) . وەك :

=



منتدى إقرأ الثقافي

تاڵ + تر ( تر + ین ) = تاڵتر ، تاڵترین
نەرم + ترم ( تر + ین ) = نەرمتر ، نەرمترین
جوان + تر ( تر + ین ) = جوانتر ، جوانترین
خاو + تر ( تر + ین ) = خاوتر ، خاوترین
...هتد .

ئەو ڕێگە سەرەکی‌یە ( واتە ـ ڕێگەی مۆرفۆلۆژی ) ، کە لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا فۆرمی پلەی باڵا ڕۆدەنێ‌و لێی‌دواین ، لە ناوچەی موکریان (٩٨)و سۆران ... یشدا بە هەمان شێوە دەبینرێ .

٢ ـ ڕێگەی لێکسیکی . ئەمیش دوو جۆری هەیە :

أ ) بەیارمەتی وشەی « هەرە »و ئاوەڵناو لە پلەی چەسپیودا . وەك :
هەرە شیرین ؛ هەرە ئازا ؛ هەرە گەورە .

---

=

**پۆست بە کوڵێ ( عامیری ) فەرمووی کە وا بۆ پوختە بوون**
**جەوتی سەر کێوان گەلێ چاتر لە ( تاڵی شاری )یە**

( نالی ، ل ٥٨٠ )

**بێ دیتن‌و بۆ واسطە چاتر لە منو تۆ**
**هیچ کەس نی‌یە نەیناسێ ئەگەر شێتە ئەگەر ژیر**

( کۆیی ، ل ٣٠ )

**بە خەندێکی دڵی بیماری ئەوچاوانە مەشکێنە**
**لە ئەم گوڵقەندە مەحروومم مەفەرموو بەڵکو چاتر بم**

( وەفایی ، ل ٥٥ )

**ئێستا ئەمن چلۆن وەدەربکەوم ؛ بۆ هیچ شاران ناچێ ڕێگایە .**
**وەرە ، میر بمکوژە ؛ چاترە گەردنت بێ خۆش‌و ئازایە ؛**

( تحفەء مظفریە ، ب١ ، ل ٣٨٠ )

دەنگی ( ك )ی وشەی ( چاك ) وەنەبێ هەر لەباری وەرگرتنی نیشانەی ( تر ، ترین )دا تێدابچێ ، بەڵکو ئەو دیاردەیە لەباری ئاسایشیـــدا دەبینرێ . وەك :

**شیعری من کامیان چا بێ**
**ئەمجا بێ‌فرمێسك نابێ**

( گۆران ، ل ١٠٤ )

( ٩٨ ) د. کەریمی ئەیووبی‌و د. ئی. ئا. سمیرنوڤا لە لاپەڕە (٣٩)ی کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ »دا دەڵێن : « ئاوەڵناو کە لە پلەی باڵادا بێ‌و بە یارمەتی پاشگر ( ڕاستتر ـ نیشانە ـ
=



منتدى إقرأ الثقافي

**ئازاد کوڕی هەرە گەورەی مام بارامە**

ب ) بە یارمەتی دەستەواژەی وەك ( لە هەموو ؛ لە هەموو شت ؛ لە سەرتاپایان ؛ لە تێکڕا ... )و ئاوەڵناو لە پلەی بەراورددا . نموونە :

**جگە لەوەش لە هەموو شت خراپتر :**
**دڵ خاڵی‌یە ، کوورەم تیا نی‌یە ئاگر ،**

( گۆران ، ل ١١٥ )

**لە هەموان پێشتر سای سینە سافان**
**مخدومی ( معدوم ) مەولەوی جافان**

( پیرەمێرد ، ل ٢٤٤ )

ئەو دوو جۆرەی ڕێگەی لێکسیکی ، کە لە زمانی ئەدەبی‌دا هەیەو لێی‌دواین ، بە هەمان چەشن لە بەشە دیالێکتی موکریان‌و سۆران ... یشدا دەبینرێ .

نموونە :

**بەزمی ئەمشەو لە هەموو شەوان زیاترە**

( تحفەء مظفریە ، ب ١ ، ل ١٨٦ )

**ئەمنیش یەکم لەوان عالەمان ، خۆدەگرم ، لە هەموان کەمتر**

( تحفەء مظفریە ، ب ٢ ، ل ٣٤٢ )

نیشانەی ( تر + ین = ترین ) ، کە لە بەشە دیالێکتەکانی سلێمانی‌و موکری‌و سۆران ... دا نیشانەی پلەی باڵایە ، لە شێوەی هەوراماندا لە وێنەی ( تەر + ین = تەرین ) دا بەدەردەکەوێ (٩٩) ، وەك ( کەمتەرین ... ).

نموونە :

**هەر گاە جەرووی لوتف ، زوڵفان عەنبەرین**
**ئەر پەرسی ، ئەحواڵ ، بەندەی کەمتەرین**

( صەیدی ، ل ١٦١ )

---

=

ئەوڕەحمان )ی ( ترین ) پێکهاتبێ دەوری دیارخەر دەبینێ‌و دەچێتە پێش ناوەکەوە ، وەك : گەورەترین شاری یەکێتی سۆوێت مەسکەوە». دەبوو نووسەرانی ئەو کتێبە ، وشەی ( دەشێ ، دەلوێ ... ) لەگەڵ ئەو ڕستەیەیاندا دابنێن ، چونکە مەرج نی‌یە هەمیشە ئاوەڵناوەکە پێش بکەوێ‌و وەك ئاشکراشە ، تەنانەت لەو نموونەیەدا کە کردوویانە بە بەڵگەی ئەو ڕایەیان ، ڕەنگە وا ڕەوانتر بێ ، کە ناوەکە پێش بخرێ‌و بوترێ : « مەسکەو گەورەترین شاری سۆوێتە » .

( ٩٩ ) بڕوانە : محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٨٨ .



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئەدەبی کۆنی کاکەیەکانیشدا ، هەروەك ناوچەی هەورامان (تەرین) بەکارهێنراوە .

نموونە :

**مەعلووم جە فیرقەی گوناهکارانم**
**کەلب کەمتەرین قاپی یارانم**

( حیلمی ، ل ۲٦۰ )

٦ - لە بەشی هەرە گەورەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی تایبەتی نی‌یە ، کە پلەی بالای پێ ڕۆبنرێ (۱۰۰) ، بۆیە ئەو مەبەستە بە ڕێگەی لێکسیکی سازدەبێ . ئەم ڕێگە لێکسیکی‌یەش بە هۆی چەند وشەیەکەوە پێكدێ :

أ ) بە یاریدەی وشەی « هەرە »وە ، کە لە پێش ئاوەڵناوی چەسپیوەوە دێت . ئەمەش ڕێگەی هەرە باوەو لە زوربەی زۆری دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێ .

چەند نموونەیێك :

**ئەحمەدی خانی مێرەکی هەرە مەزنبوو**
**نەسرین کەچەکی هەرە جوانو زیرەکە**

ب ) لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتدا بە هۆی وشەی « لاپ »ەوە کە هەر مانای « هەرە » دەگەیەنێ پلەی بالا سازدەبێ . وشەی « لاپ »یش هەروەها دەکەوێتە پیش ئاوەڵناوی چەسپیوەوە . وەك :

**ئادەمێ لاپ باش ( ئادەمیزادی هەرە باش )**
**کەچکێ لاپ ڕند ( کچی هەرە جوان )(۱۰۱)**

ج ) لە ناوچەی بادینان « هەر یێ ؛ هەر یا ؛ هەر یێد » لە پێش ئاوەڵناوی پلەی بەراوردەوە بەکاردێنن‌و پلەی بالا دروست دەبێ . وەك :

**هەر یا شیرنتر**

---

( ۱۰۰ ) لە ناوچەی بادینانی کوردستانی عێراقدا نیشانەی ( تر + ین — ترین ) بەکاردێنرێ . ( بڕوانە : ۱ — د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی « وڵاتان‌و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك‌و ناوەڕاست » ، ب۷ ، یەریڤان ، ۱۹۷۵ ، ل ۳۳۱ ؛ ۲ — ئەدەبی‌یاتی ئەو ناوچەیە . بۆ نموونە :

**... ئەڤ خوە پاراستنە مەسترین هێزە .**

( خالید حسەین ، ل ٤ )

( ۱۰۱ ) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، د. چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، زمانی‌کوردەکانی سۆڤێت ، ل ۱۱۹ .



منتدى إقرأ الثقافي

**هەر یا بلنتر**(١٠٢)

د ) لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی ئەرمەنستان‌و زمانی ئەدەبی‌یاندا « هەری » بۆ نێرینەو « هەرە » بۆ مێ‌ینەو بۆ کۆ ؛ « تەوری » بۆ نێرینەو « تەورە » بۆ مێ‌ینەو بۆ کۆ ، کە واتای « هەرە » دەگەیەنن ، بۆ سازکردنی پلەی بالآ بەکاردێنرێن‌و دەخرێنە پێش پلەی چەسپیووە .(١٠٣)

هـ ) لە بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤێتدا بە یارمەتی وشەی وەك : ( حەموو ؛ حەمووشك ؛ تەڤ ؛ گشك / گشت / گشتیك ، سافك ... )و پێشبەندی (ژ) پلەی بالآ سازدەبێ(١٠٤) . لەم بارەدا ئاوەڵناوەکە لە پلەی چەسپیودایە . بەڵام لە هەندێ بەشە دیالێکتدا ناوەناوە ئاوەڵناوەکە نیشانەی (تر)ی بەراورد وەردەگرێ(١٠٥) ، (١٠٦) ... لە ناوچەی بادینانداو بەپێچەوانەوە ئاوەڵناوەکە پتر نیشانەی (تر)ی لەگەڵ دێت . وەك :

**ڕابە خوە بکە عەتار ... هندە گوستیلکا بکرە لگەڵ بازنکا لگەڵ خوە بە ... گوستیرەکێ ژ هەمیا جوانترو مەستر ژەهری بکەو ...**

( خالید حسەین ، ل ٢٧ )

زوربەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی وایان داناوە ، کە گوایا پلەی بەراوردو پلەی بالآ تەنیا تایبەتن بە ئاوەڵناوی چۆنێتی (١٠٧) . ئەگەرچی

---

( ١٠٢ ) بڕوانە : د. مەکسیمی خەمۆ ،زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، ل ٣٣١ .

( ١٠٣ ) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، د. چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٢٠ ــ ١٢١ .

( ١٠٤ ) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢١ .

( ١٠٥ ) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢١ ــ ١٢٢ .

( ١٠٦ ) لە شێوەی کەلهوڕیشدا هەروك دیالێکتی ژووروو بەدەگمەن نیشانەی ( ترین ) بەکاردێنرێ . بۆ سازکردنی ڕێژەی پلەی بالآ بە زۆری دەستەواژەی ( لە گشت ؛ لە هەمگ ... ) دەور دەبینێ. وەك :
**وەیس‌مرا لە گشت ( لە هەمگ ... ) پیاگەیل دێکەگەمان گەوراترە.**

( ١٠٧ ) بەوێنە :
أ ــ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١٤ ــ ١١٦ .
ب ــ عەبدوڵلا شالی‌و ... ، زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٨ .
ج ــ د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو وخواروو ) مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٨٠ ــ ٨٢ ( بە زمانی رووسی ) ؛ ل ١٠٥ ــ ١٠٧ ( بە زمانی کوردی ) .
...و هەندێکی تر .



منتدى إقرأ الثقافي

به زۆری وایه ، بەڵام وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە ئەوە ئاشکرا دەکەن ، کە نەك تەنیا هەندێ ئاوەڵناوی نیسبی ، بەڵکو چەند بەشە ئاخاوتنێکی دیش نیشانەی پلەی بەراوردو پلەی باڵا وەردەگرن .

ئاشکراترین پاشگر کە یاریدەی ڕۆنانی سیفەی نیسبی بدات ، پاشگری (ی)یە . ئەم پاشگرە کاتێك دەچێتە سەر ناوێکی سادە دەیکاتە ئاوەڵناوێکی داڕێژراوو واتای نیسبی دەگەیەنێ ، وەك ( کورد + ی = کوردی؛ جیهان + ی = جیهانی ... . جا بەتایبەتی نیشانەی (تر) بە ڕەوانی دەچێتە سەر ئەو جۆرە وشانەو دەوترێ ( کوردیتر ؛ جیهانیتر ... )

ئەو جۆرە ناوانەش ، کە واتای چۆنێتیو دەلالەتی شت نیشاندەدەنو بەتایبەتیش ئەوانەیان کە دوو واتا دەبەخشن ــ واتە بۆ ناوو بۆ ئاوەڵناو بەکاردێنرێن ــ دیسان بە ئاسانی نیشانەی (تر)یان ( ترین ) وەردەگرن(١٠٨) ، وەك : بیابان ، گومان ، پیاو ، کەر ، سەگ ... هتد .

چەند نموونەیێك :

**هەچ کوێ ئەچین بیابانتر**
**جێگای ترسو گومانتر**

( گۆران ، ل ١٠٨ )

**هەندرێن لە ئازاد پیاوترە**
**هەندرێن پیاوترین کەسی ئەم گەڕەکەیە**

هەروەها جێناوی خۆیی (خۆ)و جێناوی چەندێتی (چەند)و جێناوی نەفی (هیچ) ... یش دەتوانن ئەو نیشانەیە وەربگرن .

وێڕای ئەو سێ پلەیە ( چەسپیو ، بەراورد ، باڵا )ی ئاوەڵناو ، هەروەها دیاردەی ، هێزپێدانو بێهێزکردن ؛ گەورەکردنو بچووككردنەو بەرزو نزمکردنەوە ... ی ڕادەی چۆنێتی ئاوەڵناویش هەیە ، کە ئەویش لە زمانی کوردیدا لە چەند ڕێگایەکەوە سازدەبێ :

١ ــ بە یاریدەی هەندێ پێشگر .

بە نموونە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا پاشگری ( کەلە ، ۆکە ، ۆڵە ، ۆڵ ... )و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا پاشگری ( ۆتانکی ، ۆکی ، ۆلەکی ... ) . وەك :

کەلە ــ جوانکەلە
ۆکە ــ گێلۆکە
ۆڵە ــ نەرمۆڵە
ۆڵ ــ شڕۆڵ

---

( ١٠٨ ) شایانی باسە د. چەرکەزی بەکۆ باسی ئەو حاڵەتەی کردووە . بڕوانە : سەرچاوی ناوبراو ، ل ١٢٢ .



منتدى إقرأ الثقافي

... هتد .
ۆتانکی ــ ڕەشۆتانکی
ۆکی ــ زەرکۆکی
ۆلەکی ــ سۆرۆلەکی
... هتد .

٢ ــ بە هۆی دووپاتکردنەوەی ئاوەڵناوەکەوە . ئەمیش چەند جۆرێکە:
ا ) دووپاتکردنەوەی ئاسایی .
ئەم حاڵەتە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك یەك دەبینرێن. وەك :

ڕەشڕەش
**بەرامبەر بە تۆو دوو چاوی ڕەشڕەش**
**کە ناز ئەفرۆشن بە کەچ نیگای گەش ! ...**
( گۆران ، ل ١٥٤ )

جوانجوان
**چەمی تانجەرۆی سەردەمی نیسان**
**پڕە لە وێنەی سروشتیی جوانجوان ؛**
( گۆران ، ل ١٧٧ )

هێدیهێدی
**پیرێ کازی مەلەکێد قەنجەیێ کر**
**هێدیهێدی خوە نێزیکی دەنگکر**
( سیابەندو خەجێ ، ل ١٩٠ )

ب ) دووپاتکردنەوەیێك کە یەکەم بەش پاشگری (ی) وەردەگرێ . ئەم حاڵەتەش تەنیا لە دیالێکتی ژووروودا هەیە ، وەك :
سۆریسۆر
ڕەشیڕەش
ساریسار
... هتد .

ج ) دووپاتکردنەوەیێك کە هەردوو بەشەکە پاشگر وەربگرن . بەشی یەکەم پاشگری (ی) وەردەگرێو دووەمیش ( ۆتانکی ) . ئەمەش تایبەتە بە بەشە دیالێکتی کوردەکانی ئەرمەنستان . وەك :
سۆری سۆرۆتانکی
ڕەشیڕەشۆتانکی

د ) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ژمارەیێك ئاوەڵناو هەیە لە کاتی دووپاتکردنەوەدا بەشی دووەم پاشگری ( ی ، کی ، ۆکی ) وەردەگرن . ئەو دووپاتکردنەوەیەی بە یاریدەی ئەو پاشگرانە سازدەبن لە ڕووی واتـــاوە



منتدى إقرأ الثقافي

هیچ جیاوازییان نی‌یه . تێکڕایان پلەی بەرزی چۆنێتی ڕادەگەیەنن . وەك :

سوور ــ سووری
سوور ــ سوورکی
سوور ــ سوورۆکی
تال ــ تالی
تال ــ تالکی
تال ــ تالۆکی
... هتد .(۱۰۹)

۳ ــ دانانی وشەی وەك ( زۆر ، فرە ، هێند ، هێندە / هێند ، پڕ ، چەند / چەندە ، یەکجار ، گەلێ / گەلێك / گەلە / گەلەك ، دەها ، کەم ، پچ پچێك / پچەك ... ) لە پێش ئاوەڵناوەکەوە .

چەند نموونەیێك :

**سەرپۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی**
**بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کێوی**

( گۆران ، ل ۱۲۷ )

**پێستی ڕوومەتیان هێندە ئەستوورە**
**تەڕی و تەڕیقی زۆر لەوان دوورە**

( پیرەمێرد ، ل ۲٤۲ )

**پڕ بلندە ئاستانا دەورەیێ**
**دێ بلندکە نالیا فریاد من**

( پەرتۆیێ هەکاری ، ل ۱۷۹ )

---

( ۱۰۹ ) شایانی باسە مامۆستا قەناتی کوردۆ باسی ئەو دیاردانەی کردووەو منیش لە باسی ئەو کێشەیەدا کەڵکێکی زۆرم لە کارەکەی ئەو وەرگرتووە ( بڕوانە : د. قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۸ ، ل ۸۱ــ۸۲). لێرەدا بە پێویستی دەزانم پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشم ، کە د. کوردستان موکریانی گەلێ بەندی ئەو باسەی بە هەڵەو ناتەواوی و شێواوی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی . بەوێنە د. قەناتی کوردۆ لە بەندی (۱۰۲)دا دەڵێ : « بەهێزکردن یان ناسككردنی ڕادەی چۆنێتی ئاوەڵناو بە هۆی دووپاتکردنەوەی ئاوەڵناوەکەوە یان پاشگر خستنەسەری ئەنجام دەدرێ » ( بەزمانی ڕووسی ، ل ۸۱ ). کەچی د. کوردستان بەو جۆرەی خوارەوەی وەرگێڕاوە : « بەهێزترین پلەی باڵای ئاوەڵناوی چۆنی ، ئەو ئاوەڵناوەیە ، کە سوفیکسی ئاوەڵناوی لەگەڵدا بەکاردەهێنرێت » ( بە زمانی کوردی ، ۱۰٦ ) ...



منتدى إقرأ الثقافي

**مالەك گەلە زەنگین هەبی ...**

( خالید حسەین ، ل ١٦ )

**شەمامەی چەند شیرینە**
**هەردووك لە باغەل دەنێ**

( فۆلکۆر ، ل ٨٤ )

**بەژنی چەنە بلندە**
**مامزی گەرمەلانێ**

( فۆلکۆر ، ل ٨٤ )

...و گەلێکی دی .

# ئاوەڵناو لە دۆخی ئیزافەدا

یــەك :

**وەك دیارخەر .**

١ ـ ئەگەر ئیزافە بە یاریدەی نیشانەی (ی)یەوە پێکبێت ـ واتە کـە دیارخراو نیشانەی (ی) وەبگرێ ـ ئەوە هەموو جۆرەکانی ئاوەڵناو ـ واتـە ئاوەڵناوی چۆنێتیو ئاوەڵناوی نیسبیو ئاوەڵناوی نادیار ـ بۆیان هەیە بێن ، واتە ببن بە دیارخەر . وەك :

ئاوەڵناوی چۆنێتی :

**بۆ سەوازیی دەوروپشتم ، بۆ ئاسمان ،**
**بۆ شاخی بەرز ، خانووی تازە ، دنیای جوان ...**

( گۆران ، ل ٣٤ )

**چاوی من دەمدەم دەرێژێ ئاوی صاف وخوێنی گەش**
**دا بلێن دەریای عومانە دورڕ و مەرجانی هەیە**

( نالی ، ل ٥٧٣ )

ئاوەڵناوی نیسبی

**بەسەر گۆنای سپیدا خشڵی زێڕینە بریسکەی دێ**
**پەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لێدێ**

( پیرەمێرد ، ل ١٣٦ )

**لە ژێر ئاسمانی شینا ،**
**لەپاڵ لووتکەی بەفرینا ،**

( گۆران ، ل ٢٨ )

ئاوەڵناوی نادیار :

أ ) ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە

**ئەم مانگە هەتا ئەچێتە سەر ئەبی سەد هەزار لیرەی ترم بۆ بگۆڕنەوەو**



منتدى إقرأ الثقافي

بۆم تەواو بکەن ...

( له خەوما ، ل ٤٩ )

**لایەکی یەمەنی نوغرۆ دەکا ، تەرەفی دیکەی لە دوو دەکا وێرانە .**

( تحفەء مظفریه ، ب١ ، ل ٢٢٧ )

ب ) ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن .

**قەط چ دەرگای وا نییە عالی بە شەرطی بچمەوە**
**با هەزار جورم وخەطا [ بازیار ! ] لەسەر ڕووی زەحمەتە**

( وەفایی ، ل ١١٨ )

**پیاوی وا نامرێ ، دیارە ئەمێنێ**
**لەناو عالەما بەرزو ناسراو بوو**

( بێکەس ، ل ١٤٣ )

لەم دۆخەدا ــ واتە ئەگەر ئیزافە بە هاریکاری (ی) پێکبێت ، ئــەوە نیشانەکانی (ە ، ەکە)ی ناسیاوی‌و (ێك ، ێ)ی نەناسیاوی‌و (ان)ی کۆ ... دەچنە سەر دیارخراوو دیارخەریش :

١ ) ئەگەر دیارخەر ئاوەڵناوی چۆنێتی یان ئاوەڵناوی نیسبی یــــان ئاوەڵناوی نادیار بێ ، ئەوە نیشانەکان بە شێوەی جیاواز دەچنە ســــەر دیارخراو ، وەك :

١ ــ ئەگەر دیارخەر ئاوەڵناوی چۆنێتی یان ئاوەڵناوی نیسبی بــێ ، ئەوە دیارخراو تەنیا نیشانەی (ە)و( ێك)و (ان)وەردەگرێ‌و (ەکە)و ( ەکە+ان) وەرناگرێ .

ئاوەڵناوی چۆنێتی :

دڵەی خەمگین
گوڵێکی سوور
چاڵێکی قووڵ
کچانی ئازا

بە وێنە :

**تاریك‌و لێڵ بێ ئاسمانی شینت**
**ئاهو هەناسەی دڵەی خەمگینت**

( بێکەس ، ل ٦٢ )

**لە هەچ باخێك گوڵێکی سوورم دیبێ ،**
**بۆی چووم هەزار دڕك لە پێم چەقیبێ !**

( گۆران ، ل ٤٨ )

**شێلم‌و برویش تێك‌هەڵ ئەشێلێ**
**چاڵێکی قووڵی بۆ هەڵئەکەنێ**

( پیرەمێرد ، ل ٢٧٣ )



منتدى إقرأ الثقافي

ئاوەڵناوی نیسبی :
گوڵەی کێوی
کراسێکی هاوینە
پیاوانی خێڵەکی

٢ ـ کاتێ دیارخـەر ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە بێ ، ئەو دەمـە وێڕای نیشانـەی (ێ)ی نەناسیـاوی تێکڕای نیشـانەکانی دی وەردگرێ ـ واتە ( ەکە )و ( ێك )و ( ان )و ( ەکە + ان )ی دەچێتـە سەر . وەك :
جوانەی تر
کچەکەی تر
ژنێکی تر
شارانی تر
هاوڕێکانی تر
بۆ نموونە :

**جوانەی تریش هەروەکو ئەم جوانانە ،**
**نەیتوانیوە دامرکێنێ ئەم گیانە ،**
( گۆران ، ل ٤٨ )

**گوێم گرت ژنێکی تر لەولاوە وتی بەخوا قوربان من بیستوومە ماڵـی فلانە کەس پیرۆزەیەکیان هەیە ...**
( لە خەوما ، ل ٤٥ )

**هەروەکو شارانی تر کەس ئاشنای کۆیە نەبوو**
**شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆکردەوە**
( کۆیی ، ل ٥٩ )

**لەبەردەممانا هاوڕێکانی تر ،**
**بە چۆکا هاتن وەك یخی حوشتر !**
( گۆران ، ل ١٤٨ )

٣ ـ کە دیارخەر ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن بێ ، ئەو کاتە دیارخراو هەر نیشانەی ( ێك )و ( ان )ی پێوە دەلکێ . وەك :
ئەهاێکی وا
ئاگرێکی وەها
بە نموونە :

**ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن**
**هەم نا ظیەی عوقوودنو هەم ناظیری أوموور**
( نالی ، ل ١٨٤ )



منتدى إقرأ الثقافي

**نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە**
**لاوان بە عشق ئەچوون بە بەرەوپیری مەرگەوە**
( پیرەمێرد ، ل ١١٩ )

ب ) ئەگەر دیارخەر ئاوەڵناوی چۆنێتی بێو لە حاڵەتی ( مضاف الیە )دا بێ ، ئەوە نیشانەکان بە دیارخەرەوە دەلکێن ، وەك : ( کوڕی ئازاکە ؛ کوڕی ئازایێك ؛ کوڕی ئازایان ؛ کوڕی ئازاکان ...)(١١٠)

چەند نموونەیێك

**بێستوونی عیشقی شیرینێك ئەوا هاتۆتە پێش**
**گەر لەحەق بێمو نەیەم ، تەقلیدی فەرهادێ دەکەم**
( مەحوی ، ل ٢٣٤ )

**هەرچەن هاڕەی دێ هەیاسەی جوانێك ،**
**لە هێلانەی دەم ئەفڕێ : ئامانێك ! ...**
( گۆران ، ل ١٣٣ )

**وەفدی کوردستان ، میللەت فرۆشان**
**هەرزەوەکیلی شاری خامۆشان !**
( پیرەمێرد ، ل ١٠٢ )

**نە لاوان کوژران بە گوللەو شەمستیر**
**نە پێی نازداران خرایە زنجیر**
( بێکەس ، ل ٥٨ )

٢ ــ بێتو ئیزافە بە هۆی نیشانەی ( ە )ەوە سازبێ ــ واتە کاتێ نیشانەی ( ە ) بە دیارخراوەوە دەلکێ ، ئەو دەمە تەنیا ئاوەڵناوی چۆنێتیو ئاوەڵناوی نیسبی دەتوانن بە دوایدا بێن ــ واتە ببنە دیارخەر . هەرچی ئاوەڵناوی نادیارە لەم باردا نایەت ــ واتە ناتوانێ بەدوا دیارخراوێکدا بێت، کە ( ە ) ی ئیزافەی وەرگرتبێ . وەك :

ئاوەڵناوی چۆنێتی :
کچە مەنگەکە
ئاوە جوانەکە

**ئەی کچە مەنگەکەی بە دەنگی چپە دوو ،**
**گەندەمووی دەموچاو ، مەچەك هەڵنەگرتوو ...**
( گۆران ، ل ٤٥٠ )

---

( ١١٠ ) لێرەدا کە ئاوەڵناوی ( ئازاکە ، ئازایێك ، ئازایان ، ئازاکان ) بەدوا وشەی ( کوڕ )دا هاتووەو دەوری ( مضاف الیە ) بینیوە ، هۆی ئەوەیە کە مەبەست ( کەسێك )ە ( ئازایە )و ئەو ناوەی بەردەمی کە وەسفی دەکا ، نەوتراوە .



منتدى إقرأ الثقافي

